# چوارینەکانی خەییام

وەرگێڕاوی: شێخ سەلام

لە گەڵ دەقی شیعرە فارسییەکانیدا



| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | خیام، عمربن‌ابراهیم، ۴۳۲ - ۵۱۷؟ق. |
| عنوان قراردادی | : | رباعیات. فارسی . کردی . |
| عنوان و نام پدیدآور | : | چوارینه کانی خه‌ییام(فارسی ـ کردی)/ سروده‌ی عمر خیام؛ برگردان به کردی سلام [سلیمانیه] . |
| مشخصات نشر | : | سنندج: انتشارات کردستان، ۱۳۸۷. |
| مشخصات ظاهری | : | ۲۳۷ ص. |
| شابک | : | ۲ ـ ۰۵۹ ـ ۹۸۰ ـ ۹٦٤ - ۹۷۸ |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | فارسی - کردی . |
| موضوع | : | شعر فارسی -- قرن ۵ق. |
| موضوع | : | شعر کردی -- قرن ۱۴ -- ترجمه شده از فارسی. |
| موضوع | : | شعر فارسی -- قرن ۵ق. -- ترجمه شده به کردی. |
| شناسه افزوده | : | سلیمانیه‌ای ، سلام، ۱۸۹۲ - ۱۹۵۹م.مترجم |
| رده بندی کنگره | : | PIR٤٦٢٥/ی٨٨ک٤١٣٨٧ |
| رده بندی دیویی | : | ۸فا۱/۲۲ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۷۱۳۰۳۲۱ |

# چوارینەکانی خەییام

## لەگەڵ دەقی شیعرە فارسییەکانیدا

هۆنراوەی: حەکیم عومەری خەییام

وەرگێڕوای: شێخ سەلام



انتشارات کردستان

سنندج



انتشارات کردستان

سنندج - پاساژ عزتی - تلفن: ۲۲۶۵۳۸۲

# چوارینەکانی خەییام

| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | چوارینەکانی خەییام |
| ✓ هۆنراوە (سرودەی): | حەکیم عومەری خەییام |
| ✓ وەرگێڕاوی (ترجمە): | شێخ سەلام |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول)؛ ۱۳۹۳ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۵۰۰۰ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعد اد صفحه و قطع): | ۲۴۰ صفحه جیبی |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

نرخی: ۶۰۰۰ تمەنە

شابک: ۲ - ۰۵۹ - ۹۸۰ - ۹۶۴ - ۹۷۸

ISBN: 978 - 964 - 980 - 059 - 2

# سەرەتا

«غیاث الدین» ئەبولفەتح عومەر کوڕی ئیبراهیم خەییام یەکە دانشمەند و فەیلەسووفی خۆرهەڵاتە، لە ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی هیجری لە شاری «نەیشاپوور» لە دایك بووە و لە هەوەڵی سەدەی شەشەمدا مردووە و لە گۆڕستانەکەی نەیشاپووردا نێژراوە.

دانشمەندی ناوبراو ئەمەندە زۆر تەرجەمەی حاڵی لەلایەن دانشمەندانی

خۆرئاوا و خۆرهەڵاتەوە، نووسراوە هیچ پێویست نابینم دوور و درێژ بە تان‌وپۆیا بچم و لە بنج و تیرە و ڕەگەز و ژیانی بنووسم، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٩دا لەلایەن شاعری بەرزەوە «احمد حامد صراف» کتێبێکی بەناوی «تەرجەمە و تەئلیف» لەسەر عومەر خەییام نووسیوە. لام‌وایە لە هەموو نووسراوەکانی پێشوو ڕاست و دروستتر و دوور و درێژترە، هەر جۆرە زانینێك لە کار و کردەوەی حەکیمی ناودار خواهش بفەرمووی زۆر بە ڕێکوپێکی نووسراوە.

عومەر خەییام لە پێشا لە خۆرئاواوە ناوبانگی بەرز بووەوە چونکە شاعیری ناوداری ئینگلیز «فیتزگراڵد» چەند ڕوباعییەکی بە ئینگلیزی گۆڕی؛ ئەو چەن

ڕوباعییەکارەساتێکی وای کرد ئەو شەرابە
کەعومەر خەییام لەکاتی ژیانا داوای ئەکرد
و بە ئاواتی نەگەی فیتزگراڵد بە ڕەنگی
دەرخواردی دا پارچە پارچە جومگەکانی
کە لەیەك ترازابوو و لەناو خاك و خۆڵی
گۆڕا ڕزابوو، سەرلەنوێ یەکی گرتەوە و
زیندوو بووەوە!. مەزهەبی تەناسوخەکەی
ڕاست دەرچوو لە جاران چاکتر هاتەوە
دنیا، لە هەموو یانەکانی ئاورووپادا لەلای
سەرەوەکورسی بۆ دانرا... بەڵێ فیتزگراڵدی
زیندوو عومەر خەییامی مردووی بە
ڕەنگی زیندوو کردەوە تا دنیا دنیابێ ئیتر
نەمرێ!

ئەگەر تۆزێ سەرنج لەم کار و بارە
بدەین زۆر باش دەرئەکەوێ کە عومەر
خەییامی مردووش شەربەتێکی

دەرخـــواردی فـــیتزگـــراڵد داوە کــە لە
خۆرهەڵات و خۆرئاوادا ناوبانگی وەکـوو
خۆر بدرەوشـێتـەوە. کـردەوەی خـەییام لە
کردەوەی گراڵد گەورەترە چونکە ئەو زیندوو
بوو، مردووی زیندوو کردەوە، [بەڵام] ئەم
مردوو بوو نەیهێشت ئەو لە دنیادا بمرێ،
هەتا دنیا بمێنێ ئەمێنێ!. بەڵێ زۆر ڕاستە
کە شاعیرێکی ئێران (رابیت کوردسـتانی)
ئەڵێ:



دلیـــران را پس از مـــردن دلیـری بـیشتر گـردد
که چرم گرگ بعد از خود به پیل افکن سپر گردد

بەم وتارە بچووکە سەرەتاکەمان دوایی هێنا.

## چۆن عومەر خەییامم کرد بە کوردی؟

هەرچەند تەماشای ئەو نووسراوانەم ئەکرد کە لە بابەت «خەییام»ەوە نووسراون سەرم سوڕئەما کە ئەم چەند چوار خشتەکییە بۆ بە چوار قوڕنەی دنیادا بڵاو بووەوە و بۆ بە هەموو زمانێك تەرجەمە کرا؟ جارێ ئەگەر بڵێین شاعیرێ وەکوو خەییام لە ئێرانا نەبووە ڕاست نییە؛ چونکە «سەعدی» شیرازی و «کەلیم»ی هەمەدانی و «شەوکەت»ی بوخاری و هتد... زۆر لەو شاعیرتر و پایە بەرزتر بوون. خۆ ئەگەر

بڵێین ئەم شێوەی چوار خشتەکییە کە سێ نیوەی موقەففا بێ و نیوەی چوارەم بێ قافیە بێ تەنها عومەر خەییام وای هێناوە، ئەمیش هەرچەند ئەوەندە ئیشێکی زۆر گەورە نییە چونکە ڕوباعی زادەی غەزەل و قەسائیدە و لە پێش خەییامەوە «باباتاهێر»ی هەمەدانی لەسەر ئەم شێوەیە ڕوباعیاتی وتووە، ئەوەندە هەیە کە ڕوباعیاتی باباتاهێر لەسەر وەزنی ڕوباعیاتی خەییام نییە بەڵام یەك شێوەیە.

زۆر بە بەریا ناچم تەماشام کرد، ڕوباعیاتی خەییام بە هەموو زمانێ تەرجەمە کراوە و هیچ کاتێ تەواو نابێ ساڵ لە ساڵ زیاتر شوعەرا و ئودەبا بە نەسر و نەزم پەیتا پەیتا تەرجەمەی تازە ئەکەنەوە، زۆرم لاگران بوو کە ئەم ڕوباعیاتە بە کوردی تەرجەمە نەکرێ.

سـالّی ١٩٣٨ لە «حلّە» مەئموور زەراعـەت بـووم بڕیارم دا کـە بـە شـیعر ڕوبـاعیاتی نـاوبراو بگۆڕم بـە کوردی، هەندێ نوسخەی عومەر خەییامم لە مەکتەبەکانی بەغداکڕی، لە ناو هەموویانا نووسراوەکەی «حسین دانش»م هەڵبژارد و دەستم کرد بە گۆڕینی. لە سالّی ١٩٣٩دا تاقە یەك کوڕم بوو مرد زۆر نارەحەت و دڵگیر بووم ئیتر نەمتوانی هیچی‌تر هۆشم بەلای شیعرەوە بمێنێ:

**کی شعر ترانگیز و خاطر که حزین باشد**
**یك نکته در این معنی گفتیم و همین باشد**

دەربەدەری و نارەحەتی یەك لەسەر یەك ڕووی تێکردم، بەڕاستی لە زۆر کاتا لە ژیان بێزار ئەبووم. هەتا ئیمساڵ دیسان نەقلیان کردم بۆ بەغدا یەك دوو جار

هـــاورێی خـــۆشـــەویستم مـــامۆســـتا «عـــەلائەدین ســـەجادی»م زیـــارەت کـــرد، «مومي إليه» زۆر بۆ بڵاوبوونەوەی شـیعر و ئەدەبی کوردی لە تەقەلادا بوو، بـە شـێوە جوانەکەی خۆی فەرمووی: با کـتێبـێکـی چیرۆکی بچکۆلە بنووسین، بڕیارم بۆ دا. لە پاشا پـێموت کـە: ئـەگـەر هـەڵئـەسووڕێ ڕوبـــاعیاتی عـــومـەر خـەییام کـە (٢١٦) ڕوباعییە تەرجەمەم کردووە چاپی بکە زۆر مەمنوون ئەبم، خوا هەڵناگرێ مەردانە هاتە پێشەوە و لێی وەرگرتم و دەستی پێ کرد.

تکـــای تـــایبەتی لە خـــوێنـــدەوارانـــی خۆشەویست ئەکەم کە بە چـاوی لوتـف تـــەماشا و لە نـــاڕێکـــی و نـــەزانـــینمان چاوپۆشی بفەرموون

**سەلام**

# ١

این کوزه چو من عاشق زاری بوده است
در بند سرزلف نگاری بوده است
این دسته که بر گردن او می‌بینی
دستی است که در گردن یاری بوده است



ئەم گۆزە وەك من عاشقێ بوو زار
بە تاڵی زولفی یارێ گرفتار
ئەو دەستە ئێستە تەوقی ملیەتی
دەستێ بوو، کام دەست؟! دەستی ملی یار

# ٢

پیش از من و تو لیل و نهاری بوده است
گردنده فلك برای کاری بوده است
زینهار قدم به خاك آهسته نهی
کان مردمك چشم نگاری بوده است



بەر لە من و تۆ شەو و ڕۆژێ بوو
چەرخی جەفاکار ئەهات و ئەچوو
بۆ سەر ئەم خاکە پێ بە ئەسپایی
دانێ، چاوەکەم، چاوی یاری بوو

# ٣

این کهنه رباط را که عالم نام است

وارامگه ابلق صبح و شام است

بزمی‌ست که وامنده‌ی صد جمشید است

قصریست که تکیه‌گاه صد بهرام است





ئەم کەلاوەیە کە دنیای نامە

ئارامگاهی بەیانی و شامە

بەزمێکە لە سەد جەمشید جێماوە

قەسرێکە تەکیەی سێ‌سەد بەهرامە

# ٤

آن قصر که بهرام در او جام گرفت
آهو بچه کرد و روبه آرام گرفت
بهرام که گور می‌گرفتی همه عمر
دیدی که چگونه گور بهرام گرفت



ئەو قەسرە کەوا بەهرام بوو خێوی
لانەی ئاسکە، جێ ڕاوی ڕێوی
بەهرام چۆن گۆڕی کرد بە بریانی
گۆڕیش بەهرامی واکرد بە شێوی

## ٥

در هـر دشـتی کـه لاله زاری بـوده است
آن لاله ز خـون شـهریاری بـوده است
هر بـرگ بـنفشه کـه از زمـین مـی‌رویـد
خـالیست کـه بـر رخ نگـاری بـوده است

ئـەو دەشـتە کـەوا هـەر لالەزارە
گـوڵاڵەی خـوێنی چـەن شـەهریارە
وەنەوشەی ڕەنگ‌شین لە خـاك دێـتەدەر
دەنکـە خـاڵەکـەی سـەرگۆنای یـارە

# ٦

افسوس کە سرمایە ز کف بیرون شد
و از دست اجل بسی جگرها خون شد
کس ناید از آن جهان کە تا پرسم از او
کە احوال مسافران عالم چون شد



دەستمایەی عومرم لە دەستم دەرچوو
بە پەنجەی ئەجەل جگەر کون کون بوو
ناگەڕێتەوە کەسێ لەو دنیا
تا لێی بپرسین: ئەحواڵی مردوو

# ٧

افسوس کە نامەی جوانی طی شد
وین تازە بهارِ شادمانی دی شد
آن مرغ طرب کە نامی او بود شباب
فریاد ندانم کە کی آمد، کی شد





نامەی جوانیم پیری زوو دڕی
غونچەی بەهاری شادی هەڵوەری
ئەو مەلە کەوا ناوی جوانی بوو
کەی هات نازانم! کەی؟ بۆ کوێ فڕی؟

٨

یـاران مـوافـق هـمه از دست شـدند
در پـای اجـل یکـان یکـان پست شـدند
خـوردیـم ز یك شـراب، در مـجلس عـمر
دوری دو سـه پـیشتر ز مـا مست شـدند

یارانـی هـاوسەر لە دەسـتم دەرچـوون
لە دەریـای شـینی ئـەجەل سـەرنگوون
هەر یەك شەراب و هەر یەك مەجلیس بوو
بـەڵام دوو دەورە لە مـن زیـاتر بـوون

# ٩

گویند بهشت و حور عین خواهد بود
و آن‌جا می ناب و انگبین خواهد بود
گر ما می معشوقه پرستیم رواست
چون عاقبت کار همین خواهد بود





ئەڵێن لە بەهەشت حۆری و غیلمانە
شەرابی ئاڵ و هەنگوینی شانە
نان ئەو نانەیە ئەمڕۆ لە خوانە
بۆ خۆم هەڵگرم بۆ ئەو زەمانە

## ١٠

گردون ز زمین هیچ گلی بر نارد
تا نشکند و باز به گل نسپارد
گر ابر چو آب خاک را بردارد
تا حشر از او خون عزیزان بارد

گەردوون لە زەوی گوڵ ناکا دیاری
نەیسپێرێ بە خاک، بڕوانە کاری
هەور لە جیاتی ئاو، گەر خاک هەڵگرێ
خوێنی نازاران خورزەم ئەباری

## 11

ابر آمد و باز بر سر سبزه گریست
بی بادەی گلرنگ نمی‌باید زیست
این سبزه که امروز تماشاگه ماست
تا سبزەی خاك ما تماشاگه کیست



ڕەهێڵە ئەکا هەوری بەهاران
بۆ سەبزەزاری ڕوخساری یاران
سەیرانگای منە، ئیمڕۆ ئەم سەبزە
بۆ سەبزەی ئێمە کێ دێتە سەیران؟

# ١٢

هر سبزه که در کنار جویی رسته است
گویی ز لب فرشته خویی رسته است
هان بر سر سبزه پا به خواری نه نهی
کان سبزه ز خاك لاله رویی رسته است

سەوزەگیای تازە لێوی جۆیبار
سروچکە ئەدەن دەمی نەوبەهار
نامەردت نەکەن سەرنجی بدەن
نیشانت ئەدا، تازە خەتی یار

## ١٣

تا هشیارم طرب ز من پنهان است
ور مست شوم در خردم نقصان است
حالیست میان مستی و هشیاری!
من بندەی آن کە زندگانی آن است



لە هۆشیاریما شادیم مەحاڵە
وەك لە مەستیما عەقڵم بەتاڵە
حاڵێکە بەینی مەستی و هۆشیاری
بەندەی ئەو کەسەم ئەو حاڵەی حاڵە

# ١٤

ای دل چـو زمـانه مـی‌کند غـمناکت
نـاگـاه بـرود ز تـن جـان پـاکت
بـه سبزه نشین خـوش بـزی روزی چـند
زان پـیش کـه سبزه بـردمـد از خـاکت





ئـەی دڵ زەمـانە غـەمی لێت ئـەوێ
گـیانی شـیرینت دەرئـەچێ شـەوێ
خـۆش بـژی ئـیمڕۆ لە سـەبزەزارا
بـەرلەوە سـەبزەی خـاکت سـەرکەوێ

# ١٥

چون ابر به نوروز رخ لاله بشست
برخیز و به جام باده کن عزم درست
که این سبزه که امروز تماشاگه تُست
فردا همه از خاك تو می‌خواهد رست





بەهەوری نەورۆز گوڵ چاوی شۆریا
تۆ و پیاڵە و شەراب، دامێنی چیا
ئیمڕۆ تێر سەیری سەوزە گیا بکە
سبحەی لە خاکت سەوز ئەبێ گیا

# ١٦

گویند کە دوزخی بود مردم مست
قولیست خلاف، دل در آن نتوان بست
گر عاشق، مست دوزخی خواهد بود
فردا باشد بهشت همچون کف دست



پێم ئەڵێن دۆزەخ مەخسووس بۆ مەستە
بەم واتەواتە قەت دڵ مەبەستە
گەر عاشق و مەست بچنە جەهەننەم
بەهەشت چۆڵ و هۆڵ وەك بەری دەستە

# ١٧

می خور که به زیر گل بسی خواهی خفت
بی مونس، بی رفیق، بی همدم و جفت
زینهار به کس مگو تو این راز نهفت:
هر لاله که پژمرد نخواهد بشکفت



مەی بخۆ ئێستە، ئەچیتە ژێر گڵ
بێ رۆح، بێ رەفیق، بێ هاودەم، بێ دڵ
زینهار ئەم سیڕە ئاشکرا نەکەی
کە پەژموردە بوو گەشکە ناکا گوڵ

# ١٧

می خور که به زیر گل بسی خواهی خفت
بی مونس، بی رفیق، بی همدم و جفت
زینهار به کس مگو تو این راز نهفت:
هر لاله که پژمرد نخواهد بشکفت



مەی بخۆ ئێستە، ئەچیتە ژێر گڵ
بێ ڕۆح، بێ ڕەفیق، بێ هاودەم، بێ دڵ
زینهار ئەم سیڕڕە ئاشکرا نەکەی
کە پەژموردە بوو گەشکە ناکا گوڵ

# ١٨

آنـــان کـه مـحیط فـضل و آداب شـدند
و ز جـمع کـمال شـمع اصـحاب شـدند
ره زیـــن شب تـــاریك نـــبردنـــد بـــرون
گـــفتند فســانه و در خـــواب شـــدند



ئـەو حـەکـیمانە کـە سـەردەفتەرن
خـاوەنی عـیلم و فـەزڵ و هـونەرن
لەم شـەوەزەنگە ڕێـیان دەرنـەکـرد
هەرچەن هاتن، چوون هەر بێخەبەرن

# ١٩

قـــومـــی ز گـــزاف در غـــرور افـــتادند
قـــومـــی ز پـی حـــور و قـــصور افـتادند
مـــعلوم شـــود چـــو پـــردها بـــردارنـــد
کـــــز کـــــوی تـــو دور، دور افـــتادند



قـــەومێ مـــەشغوولی درۆ و دەلەســـە
قەومێ هەر حۆری و بـەهەشتیان بـەسە
ئـــەم پـــەردە لاچـــێ ئـــاشکرا ئـــەبێ
دوورن، زۆر دوورن ئـەو جـۆرە کـەسە

## ٢٠

قــومـــی مـــتفکرنـد در مـذهب و دیــن
جـــمعی مـــتحیرنـــد در شك و یـــقین
نـــاگـــاه مـــنادی در آیـــد ز کـــمین:
کەای بـــی‌خبران راه نـــه آن است، نـــه ایـــن

قــەومێ خــەریکی مــەزهەب و دیــنن
هــەندێ دامــــاوی شك و یــەقینن
هــاکــاها جــاڕچی دەنگی هــەڵبڕی
هــەمووتان کــوێرن ڕێـی ڕاست نــابینن

# ٢١

از آمـــدن و رفـــتن مـــا ســـودی کـــو؟
و از تـــار امـــید عـــمر مـــا پـــودی کـــو؟
در چـــنبر چـــرخ جـــان چـندین پـاکـان
مـــی‌سوزد، خـــاك مـــی‌شود دودی کـو؟



گـــەر هـــاتنی مـــن قـــازانـــجی تـۆیە
تـــانی تـــەونی ژیـــن بـــۆچی بـێ‌پۆیە
لەنـــاو چـــەنبەری چـــەرخا گیانی پـاك
بـــۆچی بســـووتێ، بـــۆ ڕەنـــجەڕۆیە

# ٢٢

مــرغــی دیــدم نشســتــه بــربارەی طــوس
در پـــیش نـــهادە کـــلەی کـــیکاوس
بـا کـلّە هـمی گفت کـە افسـوس افسـوس
کو بانگی جرس‌ها و کـجا نـالەی کـوس؟

مــەلێکم بــینی لەسـەر قـەڵای تـووس
لە ژێر چنگیا بوو کـەللەی کـەیکاووس
بە کەللەی ئەگوت: ئەفسووس سەدئەفسووس
کوانێ دەنگی زەنگ؟ کوانێ ناڵەی کووس؟

# ٢٣

توبه مکن از می اگرت می‌باشد
صد توبه‌ی نادمانه در پی باشد
گل جامه دران، بلبل نعره زنان
در وقت چنین توبه روا کی باشد





نەکەی تۆ تەوبە لە مەستی بکەی
چونکە لەو تەوبە سەد تەوبە ئەکەی
گوڵ گەشکە بکا، بولبول بخوێنێ
تۆ و پیاڵە و شەراب، شیشە و جامی مەی

# ٢٤

گل صبح‌دمی به خود بر آشفت، بریخت
با باد صبا حکایتی گفت، بریخت
بد عهدی چرخ بین که گل در ده روز
سر بر زد، غنچه کرد، بشگفت، بریخت



دەمەو بەیانێ گوڵ کەوتە گرین
وتی بە سەبا بە دڵی غەمگین:
سەیری موڵەتی چەرخی بەدخوو کە
بۆ دە ڕۆژ غونچە، گوڵ و هەڵوەرین

# ٢٥

بنگر ز صبا دامن گل چاك شده
بلبل ز جمال گل طربناك شده
در سایەی گل نشین، كه بسیار این گل
از خاك بر آمده است با خاك شده

به شنەی سەبا گوڵ پەردەی دڕی
بولبول بە نالە دەنگی هەڵبڕی
لە سایەی گوڵدا دانیشە کە گوڵ
ئەبێتۆ بە خاك، لە خاك دەر پەڕی

# ٢٦

فردا علم نفاق پی خواهم کرد
با موی سفید قصد می خواهم کرد
پیمانەی عمر من به هفتاد رسید
این دم نکنم نشاط، کی خواهم کرد؟

داری بەیداخی نیفاق پەی ئەکەم
بە مووی سپیمۆ مەیلی مەی ئەکەم
پەیمانەی ژینم گەیشتە حەفتا
ئێستاکە نەیکەم فەرموو کەی ئەیکەم؟

# ٢٧

یك چـــند بـه كـودكـی بـه اسـتاد شـدیم
یك چـــند بـه اسـتادی خـود شـاد شـدیم
پـــایان سـخن نگـر كـه مـا را چـه رسـد
چـــون آب در آمـدیم، چـون بـاد شـدیم



چەندێ خـەریكی ئـاو و گـڵ ئـەبووین
یـــا بـــە سـەر بـادا ئـەهاتین ئـەچووین
قســـە هـــەزارە هـەر دووی بـــەكـــارە
وەكوو «ئاو» هاتین وەكوو «با» ئـەڕۆین

# ٢٨

آن‌ها کـه کـهن شـدند، آن‌هـا کـه نـونـد
هــرکس پس از آمــدن یکــایك بـرونـد
ایـن کـهنه جـهان بـه کس نـماند جـاوید
رفـــتند، رونـــد، دگـــر آیـــند و رونـــد





پــیر و جــوان و تـازەی نـۆ تـۆ نـوێ
یەك بە دوای یەکدا هەر ئەڕوا، هـەردێ
ئـەم دنـیا تـاسەر بـۆ کـەس نـامێنێ
هەرچی بێ ئەڕوا! ڕۆیی و چی لێ‌دێ؟

# ٢٩

رنـــدی دیـــدم نشســـته بـــر خـــنك زمـــین
نـــه کـــفر، نـــه اســـلام، نـــه دنـــیا و نـــه دیـــن
نه حق، نه حقیقت، نـــه شـــریعت، نـــه یـــقین
انـــدر دو جـــهان کـــه را بـــود زهـــرەی ایـــن؟



ڕەنـــدێکم بـــینی لە ڕووی سـەرزەمین
بـــێزار لە دنـــیا، بـــێزارتـــر لە دیـــن
حـەق، حـەقێقەت، شـەرێعەت، یـەقین
لەلای وەك پووش بووا! ئێوەش وا بـژین

# ٣٠

این چرخ طاسیست نگون افتاده
در وی همه زیرکان زبون افتاده
در دوستی شیشه و ساغر نگرید:
لب بر لب در میان خون افتاده

گەردوون تاسێکی دەمەونخوونە
دانا لە ژێریا زار و زەبوونە
سەیری دۆستیی پیاڵە و شیشە کەن
خوێن لە بەینیانا بادەی گوڵگوونە!

# ٣١

از منزل کفر تا به دین یك نفس است
در عالم شك تا به یقین یك نفس است
این یك نفس عزیز را خوش دار:
چون حاصل عمر ما همین یك نفس است

بەین کوفر و دین، هەناسەیەکە
ڕێی شك و یەقین، هەناسەیەکە
خۆش بژی دەمێ بەشۆخ و شەنگی
کە عومری شیرین هەناسەیەکە

# ٣٢

ای دل ز زمـــانه رســـم احســـان مـــطلب
و از گـــردش دوران ســـر و ســـامان مـــطلب
درمـــان طـــلبی درد تـــو افـــزون گـــردد
بـــا درد بســـاز، هـــیچ درمـــان مـــطلب

دڵــه لە دنــیا چــاکــەی چــیت ئــەوێ؟
چۆن ئــاسوودەیی بــەر تــۆ ئــەکــەوێ؟
داوای دەرمان کەی دەردت زیاد ئــەکـا
دەرمـــانت نـــەوێ، بـــە دەرد بســـرەوێ

## ٣٣

گــــاویست در آســـمان، نــامش پــرویــن
یك گـــاوی دگـــر نـــهفته در زیـــر زمــین
چشـــم خــردت گشـاى چــون اهــل یــقین
زیـــر و زبـــر دو گـــاو مشـــتی خـــربین





گـــایەك لە ئـــاسمان نـــاوی پـــەروینە
گـــایەك کـــوڵەکـــەی ژێـــری زەمـــینە
بـــە چـــاوی خـــیرەد ســـەرەنجە بـــدە
مـــابەینی دوو گـــا کـــەرگەل بـــبینە

# ٣٤

چون لاله به (نوروز) قدح گیر به دست
با لاله رخی، اگر تو را فرصت هست
می‌نوش به خرمی که این چرخ کبود
ناگاه تو را چو خاك گرداند پست

که نەورۆز گوڵی خستە سەر پەنجە
لەگەڵ دولبەری پڕ لارولەنجە
شەراب بنۆشە ئەم چەرخە شینە
«قاروونی» فەوتان، گەنجی هەر ڕەنجە

# ٣٥

در دل نتوان درخت اندوه نشاند
همواره کتاب خرمی باید خواند
می باید خورد، کام دل باید راند
پیداست که چند در جهان خواهی ماند



لە دڵدا، داری خەفەت مەڕوێنە
کتێبی عەشق ئەشعار بخوێنە
شەراب بنۆشە، پیاڵەی پەیاپەی
بە پیاڵەی لەبڕێز ڕیشەی دەربێنە

# ٣٦

چون آمدنم به من نبود روز نخست
و این رفتن بی‌مراد عزمیست درست
برخیز، میان ببند ای ساقی چُست
که اندوه جهان به می فرو خواهم شست





کێ لە هاتندا پرسی پێ کرا؟
خۆ لە مردندا هەر بە زۆر برا؟
نامەرد هەی ساقی شەرابێ تێکە
بۆ دنیای تاریك هەر مەیە چرا

# ٣٧

از درس علوم جمله بگریزی بهْ
و اندر سر زلف دلبر آویزی بهْ
زان پیش که روزگار خونت ریزد
تو خون قنینه در قدح ریزی بهْ





له عیلم و فنوون لاده بەتاڵه
بە ئاڵی زوڵف، ئەو چاوە کاڵه
بەر لەوە ئەجەل خوێنت بڕێژێ
خوێنی سوراحی بڕێژە پیاڵه

# ٣٨

بـر روی نکـوی و لب جـوی و مـل و ورد
تـــا بـــتوانـم عـیش طـرب خـواهـم کـرد
تـــا بـــودەام و بـــاشم و خـــواهـم بـودن
میخوردەام و مـــیخورم و خـــواهم خـورد

من و گوڵڕوخسار، سەوزەگیا و ناو گوڵ
هــەتا بــتوانـم کـەیف ئـەکـەم بـە دڵ
تـــا بـــبم، ئـــەژیم، ئـــەبم، ئـــەمێنم
خواردوومە، ئەیخۆم شەرابی سـەرچڵ

# ٣٩

ای دوست بـیا تـا غـم فـردا نـخوریـم

و ایـن یك دمـی عـمر را غـنیمت شـمریم

فـردا کـه ازیـن دیـر کـهن در گـذریم

بـا هـفت هـزار سـالـه گـان بـرابـریم





ڕەفـیق قـەت غـەمی بەیانی مـەخۆ

بـەم تـۆزە عـومرە مـەبە دەسـخەڕۆ

ئـەوانەی ئـەژین حـەفتا هـەزار ساڵ

وەك یـەکـە لای مـن، مـن و ئـەو و تـۆ

# ٤٠

در دهـــر هـــر آن‌کـــه نـــانی دارد
و از بـــــهر نشست آشـــیانی دارد
نــه خـادم کس بـود، نــه مـخدوم کسـان
گــو: شـاد بـزی کـه خـوش جـهانی دارد



ئـەوەی لە دونـیا لەتـێ نـانی بـوو
کـــەلاوە کـــۆنێ، ئـــاشیانی بـوو
پیاوی کەس نەبێ، کـەس پـیاوی نـەبێ
هـەر ئـەو ژیـاوە، ئـەو ژیـانی بـوو

# ٤١

گر ملك تو مصر، روم، چین خواهد بود
و آفاق زمین زیر نگین خواهد بود
خوش باش کزین جهان نصیب من و تو
ده گز کفن، دو گز زمین خواهد بود





با مولْکی توْبێ میسر و ڕۆم و چین
له ژێر پێتا بێ سارای سەرزەمین
بەشی من و توْ هەر وەکوو یەکە
دە گەز کەفەن و یەك دوو گەز زەمین

# ٤٢

ای بـــر ســر ســروران عـــالم فـــیروز
دانی کـه چـه وقت مـی بـود روح افـروز؟
یکشـــنبه و دوشـــنبه، ســـه‌شنبه و چـار
پـــنج‌شنبه و آدیـــنه و شـنبه؛ شب و روز



«شیرین» شیرینی فه‌رموو بـه خـه‌سره‌و
که که‌ی مه‌ی بـه ڕۆح ئـه‌بخشی بـره‌و؟
یه‌ك شه‌م، دووشه‌ممه، سێ‌شه‌ممه و چوار
پێنج‌شه‌ممه، جومعه، شه‌ممه، ڕۆژ و شه‌و

# ٤٣

عشــقی کــه مــجازی بــود آبش نــبود
چــون آتش نــیم مــرده تــابش نــبود
عاشق باید کـه سـال و مـاه و شب و روز
آرام و قــرار و خــورد و خــوابش نــبود





عــەشقی مـەجازی عـەشقێکی وشکـە
وەکــوو ئــاگری قــامیش و پــووشکە
عاشقی بـێقەرار ڕۆژ و مـانگ و سـاڵ
خــواردن و خـەوتن مـار و دووپشکـە

# ٤٤

امشب مـی جـام یك مـنی خـواهـم کـرد
خود را به دو جام مـی غـنی خـواهـم کـرد
اول سه طـلاق عـقل و دیـن خـواهـم داد
پس دخـتر رز را بـه زنـی خـواهـم کـرد



ئـیمشەو پـیاڵەی یـەك مـەنی ئـەکـەم
بـە دوو پـیاڵە مـەی دڵ غـەنی ئـەکـەم
هەر شەش تەڵاقی عـەقڵ و دیـن ئـەدەم
ئەوسا «کچی رەز» خـوازبـێنی ئـەکـەم

# ٤٥

ای دل چــو حــقیقت جـهان هست مـجاز
چندین چه بری خـواری از ایـن رنـج نـیاز
تــن را بــه قـضا سپار و بـا وقت بسـاز
کـه ایـن رفـته قـلم ز بـهر تـو نـاید بـاز

دنــیا بــە تـەحقیق هـەمووی مـەجازە
ڕاز و نـــیازی تـــیادا مـــەخوازە
سـینەت قــەڵغانی تــیری قــەزا بــێ
قــەڵەم چــی نــووسی، تــێپەڕی تــازە

# ٤٦

زان پـیش کـه غـمهات شـبیخون آرنـد
فــرمـای کـه: تـا بـادەی گـلگون آرنـد
تــو زر نــەای غــافل نــادان کــه تـرا
در خـــاك نــهند، بـــاز بـــرونت آرنـــد





بــەر لەوە کــە غــەم بکـا شـەبیخوون
پەیا پـەی تـێکە، تـۆ بـادەی گـوڵگوون
خۆ تۆ ئاڵتوون نیت هـەی قـەڵبی نـادان
جــارێتر لە خــاك نـابینی دەرچـوون

# ٤٧

بـــر ســـنگ زدم دوش ســـبوی کـــاشی
سر مست بـودم کـه کـردم ایـن اوبـاشی
بـــا مـــن بـــه زبـــان حـال گـفت سبو:
من چو تو بدم، تو نـیز چـون مـن بـاشی



قـاپێکی شـووشەم دا لەبـەرد، بـوو ورد
مەستو سەرخۆش بووم، زۆر نابەجێمکرد
شکـــا، زرەی هـات، زیـڕانـی و وتـی:
پیاوێ بووم وەك تۆ، خاوەن زەد و خورد

# ٤٨

هر گه که بنفشه جامه در رنگ زند
در دامن گل باد صبا چنگ زند
هشیار کسی بود که با سیمبری
می‌نوشد و جام باده بر سنگ زند



کاتێ وەنەوشە ڕەنگ شین هەڵێنێ
شنەشن شەماڵ گوڵ ئەجووڵێنێ
هوشیار کەسێکە هاوشانی دولبەر
شەراب بنۆشێ، شیشە بشکێنێ

# ٤٩

دوران جهان بی می ساقی هیچست
بی زمزمەی نای عراقی هیچست
هر چند در احوال جهان می‌نگرم
حاصل همه عشرتست، باقی هیچست!



دنیا بێ مەی و بێ ساقی هیچە
بێ زەمزەمەی نای عێراقی هیچە
سەراپا دنیا سەرنجە ئەدەم
حاسڵ عوشرەتە، ماباقی هیچە

# ٥٠

ابـــریق مـــی مـــرا شکســـتی ربّـــی
بـــر مـــن درِ عـــیش را بـــبستی ربّـــی
بـــر خـــاك فگـــندی مـــی گـــلگون مـــرا
خاکم بـــه دهـــن مگـــر تـــو مســـتی ربّـــی؟!

شـــووشەی شـــەرابت شکـــانم خـــودا
داتـــخست دەروازەی ژیـــانم خـــودا
مـــن لێـــمدا کـــەچی وا تـــۆی گـــرتووە
قـــڵپ قـــڵپ شـــەرابت ڕژانـــم خـــودا

# ٥١

نــا کــرده گــناه در جــهان کــیست بگــو؟
آن‌کس که گنه نکــرد چــون زیست بگــو؟
مــن بــد کــنم و تــو بــد مکــافات دهــی
پس فرق مــیان مــن و تــو چــیست بگــو؟



کــێ گــوناه نــاکــا؟ کــێیە پــێم بــڵێ
هیچ کــەس، بــێ گــوناه کــێیە پــێم بــڵێ
کە من بەد بکەم، تۆش هەر بــەد بکــەی
فــەرقی مــن و تــۆ چــییە پــێم بــڵێ؟

# ٥٢

صــــیاد ازل کــــه دانــــه در دام نــــهاد
صــــیدی بگــــرفت آدمش نــــام نــــهاد
هــــر نــیك و بـدی کـه مــی‌رود در عــالم
او مــــی‌کند و بــــهانه بــــر عــــالم نــــهاد



سـەییادی ئـــەزەل داوی نـــایەوە
دانـــەی بـــۆ ئـــادەم خســـتە کـــایەوە
فـــیتی خـــۆیەتی، عـــالەم بـــەد نـــاوە
«نَـــعم» بـــەهانە بـــە «بَـــلیٰ»یـــەوە

# ٥٣

در گـــوش دلم گـفت فـلك پـنهانی:
حکـم کـه قـضا بـود ز مـن مـیدانـی؟
در گـردش چـرخ اگـر مـرا دست بُـدی
خـود را بـرهـاندمی ز سـرگـردانـی!



دای بـه گـوێی دڵـدا فـەلەك پـەنهانی
تـۆ چـەوت و چـێڵی لە مـن ئـەزانـی
لەم دەورە و پـێچە گـەر دەستم ئـەبوو
خـۆم نـەجات ئـەدا لەسـەرگەردانـی

# ٥٤

گر من ز می مغانه مستم هستم
گر کافر گر بت پرستم هستم
هر طائفه‌ای به من گمانی دارند
من زان خودم، چنان چه هستم، هستم





ئەگەر بێ‌دینم، گەر بێ‌ئیمانم
ئەگەر سەرخۆشی مەیخانەکانم
هەرکەس بە ڕەنگێ لە من تێئەگا
منیش هەر ئەوەم کە خۆم ئەیزانم

# ٥٥

بـــر رهگـــذرم هـــزار جـا دام نـــهی
گـــوی كـــه بگـــیرمت اگـــر گـام نـــهی
يك زره ز حكـم تـو جـهان خـالی نـيست
تـــو حكـم كـــنی و عـــاصيم نـام نـــهی





ڕێـــبازم هــەموو بــە «داو» تــەنراوە
بــۆ هــەر لا بــڕۆم ڕێـم لێ گــيراوە
دنـــيا وەك هــەوا پــڕە لە حــوكمت
حوكم تۆ ئەيكەيت، مـن عـاسيم نـاوە!

# ٥٦

از آب، گـلم سـرشـتەای، مـن چـه کـنم؟
وین پشم و قصب تو رشتەای من چه کنم؟
هر نیك و بدی کـه از مـن آیـد بـەوجـود
تو بر سر مـن نـوشـتەای، مـن چـه کـنم؟



مـنت دروست کـرد لە گـڵ و لە ئـاو
خـوری و قـامیشت هـۆندەوە تـاوتاو
چاکـە، خـراپـە، هـەرچی کـه ئـەیکەم
یەك یەك تۆ نووسیت، من ئەکەی بەدناو

# ٥٧

آورد بە اضطرارم اول بەوجود
خبر حیرتم از حیات چیزی نفزود!
رفتیم بە اکراه، ندانیم چە بود:
زین آمدن و بودن و رفتن مقصود؟



زۆر بە پەلە پەل بۆ دنیا هاتم
حیرەتی زیاد کرد دەورەی حەیاتم
نەمزانی چی بوو مەقسوودی گەردوون
لەم هاتوچۆیە، بوون و مەماتم

# ٥٨

جامیست کە عقل آفرین می‌زندش
صد بوسە ز مهر برجبین می‌زندش
وین کوزەگری دهر چنین جام لطیف
می‌سازد، باز بر زمین می‌زندش!؟

وجوود جامێکە عەقڵ ئەنوێنێ
خێرەد لە لێوی سەد ماچ ئەسێنێ
سەیرە شیشەگەر ئەم شیشە جوانە
بۆ دروست ئەکا؟ بۆ ئەیشکێنێ؟!

## ٥٩

با یار چو آرمیده باشی همه عمر
لذات جهان چشیده باشی همه عمر
هم آخر عمر رحلتت باید کرد!
خوابی باشد که دیده باشی همه عمر!



عومرت لەگەڵ یار گەر بەسەر بێنی
هەموو هەر بە ناز بۆسە بسێنی
ئاخری ئەمری، هەر ئەبێ بڕۆی
دونیا خەوێکە ساتێ ئەیبینی!

## ٦٠

از گـــردش ایـــن دایـــرەی بـــی‌پایان
بـــر خـــورداری دو نـــوع مـــردم را دان:
یـــاباخبری تـــمام از نـــیك و بـــدش
یـــا بـــی‌خبری از خـــود و از حـــال جـــهان!





دووکـــەس لەم دنـــیا ئـــیشیان تـــەواوە
چـــەرخ وەکـــوو خـــەڕەك لایـــان ســـواوە
یـــەك: خـــەبەرداریٚ تـــەواو تـــیٚبگا
دوو: بـــیٚ‌خەبەربیٚ لەم بـــەن و بـــاوە!

# ٦١

گردون نگری ز عمر فرسودەی ماست
جیحون اثری ز اشك آلودەی ماست
دوزخ شرری ز رنج بیهودەی ماست
فردوس دمی ز وقت آسودەی ماست





گەردوون تاقێکی عومری تاڵمانە
جەیحوون فرمێسکی ئەشکی ئاڵمانە
بەهەشت ساتێکی شادی ژیانە
دۆزەخ پزیسکەی ناڵە ناڵمانە

# ٦٢

یك نان به دو روز اگـر شـود حـاصل مـرد
و ز کـوزەی شکسـته دمـی آب سـرد
مأمـور کسـی چـرا بـاید بـود
یا خـدمت چـون خودی چـرا بـاید کـرد؟





بـه دوو ڕۆژ نـانێ پـەیدا بکـا پیاو
گـۆزە شکـاوێ لەگـەڵ دوو قـوم ئـاو
بـۆچی خـزمەتی ئـەم و ئـەو بکـا؟!
وەیـا مـەئموور بێ درۆ و چـاو و ڕاو

٦٣

از جرم حضيض خاك تا اوج زحل
كردم همه مشكلات گردون را حل
برون جستم ز بند هر مكر و حيل
هر بند گشاده شد مگر بند اجل



له نەرمی زەوی تا بەرزی «زوحەل»
چەن گرێ هەبوو یەك یەك كردم حەل
لە مەكر و حیلە دەرچووم پەلە پەل
وەك خۆی مایەوە موشكیلی ئەجەل

# ٦٤

ای مـفتی شـهر از تـو پـرکـارتـریم
بـا ایـن هـمه مستی ز تـو هشیارتـریم
تو خون کسان خـوری و مـا خـون رزان!
انـصاف بـده کـدام خـون خـوارتـریم؟



ئـێمە، ئـەی مـوفتی! زۆر بـێ‌ئازاریـن
کە زۆر سەرخۆش بین زیاتر بـێداریـن
تۆ خوێنی کەس و ئێمەش خـوێنی ڕەز
هەردوو ئەیخۆینۆ، کێمان خوونخوارین؟

# ٦٥

مـــاییم خـــریدار مـــی کـــهنه و نـــو
وانگـــاه فـــروشـــندەی جـنت بـه دو جـو
دانی که پس از مرگ کـجا خـواهـی رفت؟
می پـیش مـن آر، هـر کـجا خـواهـی رو





مـــنم مشـــتەری مـــەیی کـــۆنه و نـــۆ
ئـــێمه بـــەهەشتمان داوه بـــه دوو جـــۆ
بۆ من شـەراب و تـۆ دنـیا و بـەهەشت
بـــۆ هـەر لا ئـەڕۆی فـەرموو زوو بـڕۆ

# ٦٦

یارب تو جمال آن مه مهرانگیز
آراسته به سنبل عنبربیز
پس حکم همی کنی که: در وی منگر!
این حکم چنان بود که: کجدار مریز!



جوان دروست ئەکەی ناسکتر لە گوڵ
ئەگریجە و پەرچەم، عەنبەر و سونبوڵ
نابێ سەیری کەم، سەیرە ئەم حوکمە
«دێزە هەڵ نەچێ بێتە کەف و کوڵ»

# ٦٧

افلاك كه جز غم نفزايند دگر
ننهند بەجا تا نربايند دگر
ناآمدگان اگر بدانند كه ما
از دهر چه مى‌كشيم، نايند دگر



فەلەك لافاوی غەم هەڵئەسێنێ
یەکێ لائەدا، یەکێ ئەفڕێنێ
مەعدووم بزانێ ئەحواڵی مەوجوود
بۆ سەر ئەم دنیا کێ پێ هەڵدێنێ؟

## ٦٨

ما خرقەی زهد بر سر خُم کردیم
و از خاك خرابات تیمم کردیم
شاید بە در میکدەها دریابیم:
آن عمر کە در مدرسەها گم کردیم



خەرقەم سەرپۆشی سەر سەری خومە
خۆڵی مەیخانەم بۆ تەیەممومە
جێ شەوی منە گۆشەی مەیخانە
ڕێگەی مزگەوتم بە ڕۆژ لێ گومە

## ٦٩

عمرت چه دوصد بود، چه سیصد، چه هزار
ز این کهنه سرا برون برندت ناچار
گر پادشهی و اگر گدای بازار
این هر دو یك نرخ بود آخر کار





عومرت دووسەد بێ سێسەد بێ، هەزار
لەم وێرانەیە دەرئەچی ناچار
هەردوو یەك نرخە، هەروەکوو یەکە
پاشای شاران بی یا گەدای بازار

# ٧٠

گـــویند بـــهشت و حـــور و کـــوثـر بـاشد
جوی مـــی و شـــیر و شـــهد و شکـــر بـاشد
یك جـــام بـــده بـــه یـــاد آن ای ســاقی
نـــقدی ز هـــزار نسـیه بـــهتر بـاشد





ئەڵێن لە بـەهەشت حـۆری و کـەوسەرە
جـۆگـەی شـەراب و شیر و شـەکـەرە
جـامێ شـەرابـم بـۆ تـێکە ساقی!
حـازر بێ کـەم بێ لەقـەرز چـاکترە!

# ٧١

یك جرعـه‌ی مـی، مـلك جـهان مـی‌ارزد
خشت سـر خُـم، هــزار جـان مـی‌ارزد
آن کـفه کـه لب ز مـی بـه دو پـاك کـنند
حــقا کــه هــزار طــیلسان مــی‌ارزد



دڵــۆپێ شــه‌راب دونــیا ئــه‌هێنێ
خشتی ســه‌ر کـووپه‌، ڕۆح ئـه‌جووڵێنێ
ئــه‌و پــه‌شته‌ماڵه لێــوی پــێ ئــه‌سڕن
قــیمه‌تی هــه‌زار بــه‌رماڵ ئــه‌شکێنێ

# ٧٢

این اهـل قـبور خـاك گشـتند و غـبار
هـــر زره ز هـــر زره گـــرفـتند كـنار
آه این چه شرابـیست کـه نـاخورده درست
بـی‌خود شـده، بـی‌خبرنـد از همه کـار؟!



مردووی قەبرستان بوون بە تۆز و خـاك
زەڕڕە لە زەڕڕە تـــرازان تـــاك تـــاك
وای لەم شـــەرابـــە هـەر بـە یـەك پـیاڵە
بێ‌خەبەر، بێ‌هۆش عـالەم بـوو هـیلاك

# ٧٣

آن گــه کــه نــهال عــمر مــن کـنده شـود
و اجــزام ز یکــدگر پــراکــنده شــود
ور زان که صـراحـی‌ای کـنند از گـل مـن
حـالی کـه پـر از مـیش کـنی زنـده شـود





کــەی گــەڵای عــومرم لە دار تــرازا
جــومگەم یــەك لە یــەك داخــزا، ڕزا
خـاکـم سـوراحـی بکـەن پڕ لە مـەی
پـژمەیەك ئـەکـەم، هـەڵئەستم ئـازا

# ٧٤

بــر خــیز مــخور غــم جــهان گــذران
خوش بــاش، دمــی بــه شــادمانی گــذران
در طــبع جــهان اگــر وفــای بــودی
نــوبت بــه تــو خــود نــیامدی از دگــران





هــەڵسە غــەم مــەخۆ، دنــیا وەك بــایە
بــە شــادی بــژی، دەرچــۆ لەم کــایە
گــەر دنــیا ســەری وەفــای بــبوایە
لەبــەر خــەڵق نــۆرە بــۆ ســەر تــۆ نــایە

# ٧٥

ایـــن چـرخ فـلك بــهر هـلاك مـن و تـو
قـــصدی دارد بـــه جـان پـاك مـن و تـو
بـر سـبزه نشـین، پـیاله کش، دیـر نـماند
تـــا سـبزه بـرون دمـد ز خـاك مـن و تـو





گـــیانه دوشـــمنه ئــەم چـــەرخه پـیره
دوشـــــمنی گـــیانی پـــاشا و وەزیـــره
کـۆڕی بـه حـەڵقه لەسـەر سـەوزه گـیا
هــاکــا له خــاکت گـیا دای زنـجیره

# ٧٦

با سرو قدی تازه‌تر از خرمن گل
از دست مده جام می و دامن گل
زان پیش که ناگه شود از گرگ اجل
پیراهن عمر تو چو پیراهن گل

لەگەڵ یارێکدا وەك خەرمانەی گوڵ
بگرە شەراب و شیشە، گوڵ و موڵ
بەر لەوەی گورگی ئەجەل کراست
بدڕێنێ، بدڕە تۆ دامانی گوڵ

# ٧٧

ساقی، گل و سبزه بس طربناك شده است
در یاب که: هفته‌ی دگر خاك شده است
می نوش و گلی بچین که تا در نگری:
گل خاك شده است و سبزه خاشاك شده است



ساقی! سەوزەگیا و گوڵ تێك ئاڵاوە
تێپەڕی بەهار حەوت ڕۆژی ماوە
شەراب بنۆشە، سبحەی ئەیبینی
گوڵ، خاك، گیا، دڕك، سەبزە فەوتاوە

# ۷۸

در دایــــره‌ی ســپهر نــا پـیدا غــور
می نوش به خوش‌دلی که دور است به جور
نــوبت چــو بــه دور تــو رسـد آه مکـن
جـامیست کـه جـمله را چشـانند بـه دور



دائــیره‌ی گــه‌ردوون بــه‌حری بــێ‌بنه
شــه‌راب بــنۆشه، چــه‌رخ دوشــمنه
ده‌ور ئــه‌دا ئــه‌جه‌ل، ده‌وره‌ت دێــته‌سه‌ر
شــه‌رابــی مــه‌رگ چــاره‌ی چــه‌شتنه

# ٧٩

بـــردار پـــیاله و ســبو، ای دلجــو
بـــرگـــرد بگـــرد ســبزه‌زار و لب جــو
کـــه ایـــن چـرخ بســی قـد بـتان مـهْ رو
صـــد بـــار پیاله کـرد و صـد بـار سبو



ســوراحـــی و پـیاڵه یـاری دڵ نـازدار
هــەڵگره بـــڕۆین، بـــۆ گـــوێ‌سه‌بزه‌زار
له قـــه‌د و بـــاڵای یـاران ئـه‌م چـه‌رخه
سه‌د بار پیاڵه‌ی کرد، سوراحی سه‌دجار

## ٨٠

طـــبعم هـــمه بـا روی چـو گـل پـیونـدد
دســتم هـــمه بـــا ســـاغر مُـل پـیونـدد
از هــر چـــیزی نـــصیب خـــود بـــردارم
زان پـــیش کـه جـزءهـا بـه کـل پـیونـدد

تەبعم لەگەڵ ڕووی وەك گوڵ تێکەڵ بێ
دەست و پیاڵە، گـوڵ چـڵ تـێکەڵ بـێ
مـــن لە هـــەر بـــاغێ گـــوڵێ ئـــەچنم
بـــەر لەوە ئـــەجزام بـە گـڵ تـێکەڵ بـێ

# ٨١

اسرار ازل را نه تو دانی و نه من
و این حرف (معما) نه تو خوانی و نه من
هست از پس پرده گفتگوی من و تو
چون پرده برافتد نه تو مانی و نه من





سەتری ئیزەدی هیچمان نایزانێ
هەروەك مەتەڵە، کێ هەڵی دێنێ؟
لەپشت پەردەوە گفتوگۆمانە
ئەو پەردە لاچێ، کەسمان نامێنێ

# ٨٢

بسیار بگشتیم بگشتی در و دشت
اندر همه آفاق بگشتیم به گشت
کس را نشنیدیم که آید زین راه
راهی که برفت راهرو بازنگشت

ئێمە زۆر گەڕاین بە دەر و دەشتا
دنیام پشکنی ورد ورد لە گەشتا
بە دوو چاو نەمدی تاقە ڕێبوارێ
بە دوو گوێش نەمبیست بێتەوە هێشتا

# ٨٣

اجزای پیاله که در هم پیوست
اشکستن او کجا روا دارد مست؟
چندین سرو ساق نازنین و کف و دست
از مهر که پیوست؟ به کین که شکست؟



ئەو پیاڵە کەوا دە پوول ئەهێنێ
سەرخۆش مەستیش بێ هەر نایشکێنێ
ئەم سەر و دەست و پەنجە شیرینە
کردگار بۆ ئەیکا و هەڵیەوەرێنێ

# ٨٤

مـــاییم درافـــتاده چـــون مـــرغ بـــه دام
دل خســـــتەی روزگـــار، آشـــفته مـــدام
سر گشـــته در ایـــن دایـــرەی بـــی در و بـــام
نـــا آمـــده بـــر مـــراد، نـــا رفـــته بـــه کـــام

کـــەوتینە داو و دۆزاخـــە وەك مـــەل
هـــەر فـــرتە فـــرت و داخ و پـــەلە پـــەل
گـــیرۆدەی دنـــیای بـــێ‌درگا و بـــانین
هـــاتین بـــێ مـــوراد ئـــەڕۆین بـــێ ئـــەمەل

# ٨٥

دارنده چو ترکیب طبایع آراست
از بهر چه او فگندش اندر کم و کاست؟
گر نیك آمد، شکستن از بهر چه بود؟
ور نیك نیامد این صور، عیب کراست؟





له ڕێك‌خستندا زاتی کردگار
بۆ تەبائیعی دانا ناهەموار
گەر ڕێکوپێکە شکانی له چی؟
وەگەر ناڕێکە، کێیە گوناهکار؟

# ٨٦

هـر چـند کـه رنگ و بـوی زیـباست مـرا
چــون لاله رخ و چـو سـرو بـالاست مـرا
مـعلوم نشـد کـه در طـرب‌خـانه‌ی خـاك
نــقاش ازل بــهر چــه آراست مــرا؟



هەرچەند ڕەنگ و ڕووم، جوان و ڕەنگینە
بـاڵا وەك سـەرو و ڕوومـەت نـەسرینە
بــەڵام نــازانــم بــۆ لە دنـیادا
وا ڕازامــەوە، بــۆ لام شــیرینە؟

# ٨٧

آغــاز روان گشــتن ایــن زریــن طــاس
و انــجام خــرابــی چــنین نــیك اساس
دانســته نــمی‌شود بــه مــعیار عــقول
ســنجیده نــمی‌شود بــه مــقیاس قــیاس

لە گــەرد و خــولی ئـەم چـەرخە شــینە
یــا بــۆ تــێکچوونی ئـەم سـەرزەمینە
مــەحەکــی عــقل و تــرازووی قــیاس
قــەڵبە، ســەر ئـەکــا! فــەرموو بــیبینە

# ٨٨

شادی بطلب که حاصل عمر دمیست
هر زره ز خاک کیقبادی و جمیست
احوال جهان و اصل این عمر که هست
خوابی و خیالی و فریبی و دمیست





کەیف بکە، ژیان نەفەس دانێکە
یەك زەڕڕە لە خاك نەوشیروانێکە
ئەحواڵی دنیا و ژیانی هەموو
خەو و خەیاڵ و تەفرەدانێکە!

# ٨٩

یك هــفته شـراب خـورده بـاشی پـیوست
هـان تـا نـدهی بـه روز (آدیـنه) ز دست
در مــذهب مـا شـنبه و آدیـنه یکـیست
جـبار پـرست بـاش نـه روز پـرست



هــەر هــەفته بــخۆ شـرابـی ڕەنگـدار
له دەست دەر نەکەی جومعە سەد زینهار
له لای من جومعە و شەممە وەك یـەکـە
یــەزدانپـەرستم نــە وەك ڕۆزگــار!

# ٩٠

ساقی قدحی کـه کـار عـالم نـفسی است
گر شادی ازو یك نفس آن نیز بسـی است
خوش باش به هرچه پیشت آید که جـهان:
هرگز نشود چـنان‌چه دلخـواه کسـی است!





شـەرابـێ، دنـیا هـەر یـەك نـەفەسە
یـەك نـەفەس شـادی لەلای مـن بـەسە
چوون هات گەردشی گەردوون، بسـازە
چونکە چەرخی چەرخ بەرعەکسی کەسە

# ٩١

زان پیش که از زمانه تابی بخوریم
با یکدگر امروز شرابی بخوریم
که این چرخ فلك به وقت رفتن ما را
چندان ندهد امان که آبی بخوریم!



بەرلەوە یەك یەك لەدنیا بڕۆین
ئەمڕۆ پێکەوە شەرابێ بخۆین
وەختی ڕۆینمان چونکە ئەم چەرخە
وچانمان نادا دەم و چاو بشۆین!

# ٩٢

یـــارب تـــو کـــریمی و کـــریمی کـــرم است
عـــاصی ز چـــه رو بـــرون ز بـــاغ ارم است
بـــا طـــاعتم ار بـــبخشی آن نـــیست کـــرم!
بـــا مـــعصیتم اگـــر بـــبخشی کـــرم است



بـــەخشندەگـــی تـــۆ لە عـــالەم بـــاوە
عـــاسی لە بـــەهەشت بـــۆ دەرکـــراوە؟
بەهەشت بە تاعەت لە کـــوێ بـــەخشینە؟
لەگـــەڵ گـــوناهدا بـــەخشین، تـــەواوە

# ٩٣

گر گل نبود نصیب ما خار بس است
ور نور به ما نمی‌رسد نار بس است
گر خرقه و خانقا، شیخی نبود
ناقوس و کلیساو زنار بس است



ئەگەر گوڵ نەبێ هەمە دڕك و خار
وەگەر نوور نەبێ زۆرە گریە و نار
خەرقە، خانقا، شێخم گەر نییە
هەیە ناقووس و کەلیسا و زونار

# ٩٤

برخیز، بده باده چه جای سخن است؟
که امشب دهن تنگ تو روزیِ من است
ما را چو رخ خویش میِ گلگون ده
که این توبه‌ی من چو زلف تو پر شکن است





هەڵسە شرابێ، وەخت نەماوە
دەمی تەنگی تۆم ڕۆزی بڕاوە
شرابێ ئاڵ بێ، وەك گوڵی كوڵمت
تەوبەم وەك زوڵفت: چین چین شكاوە

# ٩٥

مـــی‌خوردن و گـــردی نـیکوان گـردیـدن
بـــهْ زان کـــه بـــه رزق زاهـدی ورزیـدن
گـر عـاشق مست دوزخـی خـواهـد بـود
پس روی بــهشت کس نـخـواهـد دیـدن!





شـــەراب نـــۆشین و هـاوشانی دولبـەر
چـــاکـــترە لە ڕیـای زاهـدی نـوێژکەر
گەر عـاشق و مـەست بـچنە جـەهەننم
بەهەشت چوڵ و هۆڵ، لەم سەر تا ئەوسەر

# ٩٦

تا کی ز چراغ مسجد و دودی کنشت؟
تا کی ز زیان دوزخ و سود بهشت
رو بر سر لوح بین که استاد قضا
اندر ازل آنچه بودنی بود نوشت



تاکەی بۆ مزگەوت، یا بۆ کەنشت چوون؟
تاکەی بۆ بەهەشت لە دۆزخ دەرچوون؟
بڕۆ ببینە: سەر لەوحەی قەزا
چی بوو لە ئەزەل نووسی، بەرلەبوون

# ٩٧

آن روز کــه تــوســن فــلك زیــن کــردنــد
و آرایش مشــتری و پــرویــن کــردنــد
ایــن بــود نــصیب مــا ز دیــوان قــضا
ما را چه گــنه، قسـمت مــا ایـن کـردنـد؟





ئـەو ڕۆژە ئـەسپی گـەردوون زیـن کـرا
مشــــتەری و پــەروین ئــارایش درا
هەرکەس بـەشی خـۆی درایـە دەسـتی
گــوناهمان چــییە؟ وەهــا بــەش‌کرا!

# ٩٨

آنـــان کـه بـه کـار عـقل در مـی‌کوشـند
هیهات کـه جـمله (گـاو نـر مـی‌دوشـند)
آن بـــه کـــه لبـــاس ابـلهی در پـوشـند
کـــه امـروز بـه عـقل تـره مـی‌نفروشـند





ئـــەوانـە کـــە وا بـــە بـیر و هــۆشن
هــەموو خـــەریکی: (نـێره بـیدۆشن)؛
عــەقڵ سـەر بـە سـەر تـەڕەپیاز نـاکـا
وا چـــاکـــە جـــلی ئــەبلەهـ بـپۆشن!

# ٩٩

بـــر مـــفرش خـــاك خـــفتگان مـــی‌بینم
در زیـــــر زمـــین نـــهفتگان مـــی‌بینم
چـــندان‌کـه بـــه صـــحرای عـــدم مـــی‌نگرم
نـــــاآمدگان و رفـــــتگان مـــــی‌بینم



لەسـەر فـەرشی خـاك خـەوتوو دیـارە
لە ژێـــر زەویـــدا کـــەوتوو دیـــارە
کـە دەشـتی «عـەدەم» سـەرنجە ئـەدەم
چـین چـین نـەهاتوو و هـاتوو دیـارە

## ١٠٠

هـر گـه کـه طـلوع صـبح ازرق بـاشد
بـاید بـه گـفت مـی مـروق بـاشد
گـویند در افـواه کـه حـق تـلخ بـود
بـاید کـه بـدین دلیـل مـی حـق بـاشد





سـه‌ر له بـه‌یانه ده‌مـی شـه‌فه‌قه
له پـیاڵه و شـووشه هـه‌ڵسێنمه تـه‌قه
مـه‌شهوور و بـاوه: حـه‌ق تـاڵ و ڕه‌قـه
بـۆیه مـه‌ی تـاڵه، مـه‌علوومه حـه‌قه

## ١٠١

آبـــادی مـــیخانه ز مـی خـوردن مـاست
خـــون دو هـــزار تـوبه در گـردن مـاست
گـــر مـــن نکنم گـناه رحــمت چـه کـند
آرایش رحـــمت از گـــنه کـــردن مـــاست





مـــه‌یخانه دایــم بــه مــن ئــاوایــه
خــوێنی دوو هــه‌زار تــه‌وبه‌م له لایـه
من گوناه نه‌که‌م ڕه‌حمه‌ت چی ئـه‌کـا؟
ڕه‌حمه‌ت بێ‌گوناه چییه؟ چـی تـیایه؟

# ١٠٢

دردە مــی لعــل لالەگــون ای ســاقی
بگشــا ز گــلوی شــیشە خــون ای ســاقی
کە امروز بــرون ز جــام مــی نــیست مــرا
یك مــحرم پــاك انــدرون ای ســاقی



ســاقی: شــەرابــی عــقیق بــنوێنە
لەگەرووی شــیشە دەی خــوێن بــڕژێنە
بــە غــەیری جــام و شــەراب مــن نــیمە
هــاوڕازی دڵ پــاك وەکــوو ئــاوێنە

# ١٠٣

صبح است دمی بر می گلرنگ زنیم
وین شیشەی نام و ننگ بر سنگ زنیم
دست از امل دراز خود باز کشیم
در زلف دراز و دامن چنگ زنیم



بەیانە ساقی شەرابی گوڵڕەنگ
وردی کەین بە بەرد شیشەی نام و نەنگ
دەست لە ئومێدی ژاکاو هەڵگرین
بۆ زوڵفی لوول و بۆ دامانی چەنگ

# ١٠٤

زان مـــی کـــه مـــرا قـــوت روانست بـده
زان گـر چـه سـرم بسـی گـران است بـده
بر نه به کفم قـدح کـه دهـر افسـانه است
و ایـــن عـــمر چـــو بـاد گـذرانست بـده

•••••• ━━━● ● ●━━━ ••••••

لەو مـــەیە جـــامێ قـــووتی ڕەوانـــە
بـمدەرێ هـــەرچەن سـەرم گـرانـــە
دنـــیا وەکـــوو «بـــا» دێ، تـــێئەپەڕێ
بـــۆ دەردی دنـــیا هـــەر مـەی دەرمـانە

# ١٠٥

تــا بــتوانــی رنــجه مگــردان کس را
بــر آتش خشــم خــویش مــنشان کس را
گــر راحت جــاودان طــمع مــی‌داری؟
مــی‌رنــج هــمیشه و مــرنــجان کس را





دڵ‌ئــازار مــەبە، قــەت دڵ مــەشکێنە
بــە ئــاگــری ڕق، کــەس مــەسووتێنە
گەر ئاسوودەگی یەك جاریت ئــەوێ؟
خــۆت بــڕەنجێنە، کــەس مــەڕەنجێنە

# ١٠٦

یک جام شراب صد دل و دین ارزد
یک جرعەی می مملکت چین ارزد
جز بادەی لعل نیست در روی زمین
تلخی کە هزار جان شیرین ارزد





یەک پیاڵە شەراب سەد دڵ و دینە
تەنیا یەک چۆڕی چین و ماچینە
لە سەر ڕووی زەمین تەنها شەرابە
تاڵێکە گیانە؛ گیانی شیرینە

# ١٠٧

از آمـــدنم نـــبود گــردون را ســود
و از رفــتن مــن جــمال جاهش نــفزود
و از هــیچ کسـم نـیز دو گـوشـم نشـنود
که ایـن آمـدن، رفـتنم از بـهر چـه بـود؟



لە هاتن غەیری دەردی‌سەر چـی بـوو؟
لە مردن غـەیری دەربـەدەر چـی بـوو؟
لە هیچ‌کەس نەم‌بیست من بەم دووگوێیە:
ئەم هاتوچوونەی من لەبـەر چـی بـوو؟

# ١٠٨

ای دل تــو بــه ادراك مــعما نــرســی
در نکــتەی زیــرکــان دانــا نــرســی
ایــن‌جا ز مــی لعــل بــهشتی بــر ساز
که آن‌جا که بهشت است برسی یا نــرســی!



دڵــە تــۆ دەرکــی مــوعەمما نــاکــەی
وا زوو لە نــوکتەی دانــا تــێناگــەی
لێــرە لە شــەراب بــەهەشتێ ســازدە
لەوێ بە بەهەشت ئەگــەی یــا نــاگــەی!

# ١٠٩

ایـــن قـصر کـه بـر چـرخ هـمی‌زد پـهلو
بـــر درگـــه اوشـــهان نـــهادندی رو
دیـــدیم کـــه بـــر کـــنگره‌اش فـاخته‌ای
بنشسته همی گفت کـه: کـو کـو کـو کـو



ئه‌و قه‌سره که وا جووتیٚ چه‌رخ به‌رزبوو
شاهان بۆ ده‌رگای ئه‌چوون ڕوو بـه ڕوو
یــه‌ك قــومریم بــینی له ســه‌رته‌لاری
به ناڵه ئه‌یگوت: کوو کوو کوو کوو کــوو

# ١١٠

چون نیست درین زمانه سودی ز خرد
جز بی‌خرد از زمانه سودی نخورد
پیش آر از آن می که عقل ببرد
تا بو که زمانه سوی ما بهْ نگرد





عەقڵ بێ‌سوودە ئەمڕۆ، زەرەرە
سوودی زەمانە بۆ پیاوی کەرە
شەرابێ بێنە عەقل لابەرێ
ئەوسا بۆ ئێمەش چەرخ جیلوەگەرە!

# ١١١

من بندەی عاصیم رضای تو کجاست؟
تاریك دلم، نور و ضیای تو کجاست؟
ما را تو بهشت اگر به طاعت بخشی
این بیع بود لطف و عطای تو کجاست؟





من گوناهکارم ڕەزای تۆ کوانێ؟
تاریکە دڵم چرای تۆ کوانێ؟
بەهەشت بەخشینت گەر بە تاعەتە
پێ فرۆشتنە؛ عەتای تۆ کوانێ؟

# ١١٢

طبعم به نماز و روزه چون مائل شد
گفتم: که مراد کلیم حاصل شد
افسوس که آن وضو به گوزی بشکست
و این روزه به نیم جرعه می باطل شد



دڵ نوێژ و ڕۆژوو کەوتە کەڵکەڵەی
وتم: مرادم هاتە دی ئۆخەی
لەولاوە دەسنوێژ بە تڕێ شکا
لەملاوە ڕۆژوو بە یەك قەترە مەی

# ١١٣

بلبل چو به باغ ناله بر دست گرفت
مى بايد همچو لاله بر دست گرفت
زان پيش كه مردمان از سر جهل
گويند: (فلان) پياله بر دست گرفت



لە باغا بولبول کەوتە ناڵە
لە سەر دەست پیاڵەی شەرابی ئاڵە
بەر لەوە خەڵقی یەك بە یەك بڵێن:
دیسان فلانی دەستی دا پیاڵە

# ١١٤

ای دل همه اسباب جهان خواسته گیر
باغ طربت ز سبزه آراسته گیر
وانگاه بر آن سبزه شبی چون شبنم
بنشسته، بامداد برخاسته گیر

دڵە ئەسپابی عوشرەت بسێنە
سەوزەگیا بە جێ شادی بنوێنە
لە سەر ئەو سەبزە شەوێ وەك شەونم
دانیشە بەیان هەڵهات مەمێنە

# ١١٥

در سـر مگـذار هـیچ سـودای مـحال

مـی خـور هـمه سـال سـاغر مـالامـال

بـا (دخـتر رز) نشـین، عـیش مـی‌کن

دخـتر بـه حـرام بـه کـه مـادر بـه حـلال



لەو فـیکرە لادە لە لات مـەحاڵە

بـەر مـەدە شیشە و شـەراب و پـیاڵە

«کچی ڕەز» بگرە، گوێ مەگرە لە خەڵق

ئـەڵێن: کـچ حـەرام، دایك حـەڵاڵە!

# ١١٦

آن‌هـا کـه ز پیش رفته‌اند ای سـاقی
در خـاك غـرور خـفته‌انـد ای سـاقی
رو بـاده خـور، حـقیقت از مـن بشـنو:
باد است هر آن‌چـه گـفته‌انـد ای سـاقی!





هـەرکەس زوو ڕۆیـی لە دنـیا دەرچـوو
لە ژێـری خـاکـا یـەکـایەك نـوستوو
بـادە بـنۆشە، ڕاسـتت پـێ ئـەڵێم:
هـەرچی وتـراوە وەك «بـا»یـە هـەموو

# ١١٧

تــا چــند حــدیث پــنج و چــار ای ســاقی
مشکل چە یکی، چە صد هزار، ای ساقی؟
خــاکــیم هــمە؛ چــنگ بســاز ای مــطرب
بــادیم هــمە، بــادە بــیار ای ســاقی





تاکەی باس و خواس لە پێنج و لە چوار
چ یەك بێ موشکیل چ خۆ سەد هەزار
گەر چنگێ خاکین چەنگی ڕوبابی...
ئەگەر لە بادین بادە بێنە یار!

# ١١٨

با باده نشین که ملك محمود اینست
و از چنگ شنو که لحن داود اینست
از آمده و رفته دگر یاد مکن
حالی خوش باش زانکه مقصود اینست





بێ بادە مەبە مڵکی مەحموودە
گوێ بگرە لە چەنگ لەرەی داوودە
لە هاتن لە چوون ئەندیشە مەکە
کەیف بکە ئێستە، ئێستە مەوجوودە

# ١١٩

تـــا بـاز شـناختم مـن ایـن پـای ز دست
ایـــن چـــرخ فـرومـایه مـرا دست بـبست
افسوس کـه در حسـاب مـا خـواهـد شـد
عمری که مرا بی می و مـعشوقـه گـذشت



کـــاتێ کــە نـــاسیم مـن لەپـی دەسـتم
چـەرخی بـەدمایە دوو دەسـتی بـەستم
ئەم حاڵە بە ژین چۆن حیساب ئەکرێ؟
نـــە یـــار، نـە بـادە، نـە تـۆزێ مـەستم

# ١٢٠

این قــافلەی عــمر عــجب مــی‌گذرد
دریــاب دمــی کــە از طـرب مــی‌گذرد
ساقی غـم فـردای حـریفان چـە خـوری؟
پــیش آر پــیالە را کــە شب مــی‌گذرد

کــاروانــی عــومر تــێپەڕی وەك خــەو
هــانا شــەرابــێ، لادە لەم و لەو
غــەمی بــەیانی ئــێستە بــۆ ئــەخۆی
ســاقی شــەرابــێ وا تــێپەڕی شــەو

# ۱۲۱

ایــزد بــه بــهشت وعــده بـر مـا مـی‌کرد
بر خلق درین جـهان حـرامش کـی کـرد؟!
شخصی ز عرب نـاقه‌ی (حـمزه) پـی کـرد
پـــیغمبر مـــا حـــرام مـــی بـــروی کـــرد





شه‌راب له به‌هه‌شت بـۆ خـاس و عـامه
له‌م دنـــیا مــه‌نعی هــه‌ر بــۆ نــه‌فامه
لاقـــی حـــوشترێ «حـــه‌مزه» عــاره‌بی
پەڕاندی؛ بۆ من مـه‌ی کـه‌ی حـه‌رامـه؟

# ۱۲۲

ای رفته و باز آمده (بَلْ هُمْ) گشته
نامت ز میان نام‌ها گم گشته
ناخن همه جمع آمده و سم گشته
ریش از پس کون آمده و دم گشته



هاتنت، چوونت ئایەی «بَلْ هُمْ» بوو
ناوت لە ناوی ناواندا گوم بوو
ناخون کۆمەڵ بوو ها لێت بە سم بوو
ڕیشت کەوتە دوا وا لێت بە دوم بوو

# ١٢٣

گویند کسان: بهشت با حور خوش است
من می‌گویم کـه آب انگـور خـوش است
ایـن نـقد بگـیر دست از آن نسـیه بـردار
که آواز (دهل) شنیدن از دور خـوش است



لەلای خەڵق بەهەشت لەگەڵ حوور خۆشە
لەلای من ئـاوی (تـرێسوور) خـۆشە
ئـەم نـەقدە بگـرە ئـەو وەعـدە بـەردە
کە دەنگی دەهۆڵ هـەر لە دوور خـۆشە

# ١٢٤

جـــامی و مـــی و ســـاقی، بـر لب کشت
این جملە مرا نـقد و تـو را نسـیه بـهشت
مشـــنو ســـخن بـــهشت و دوزخ از کس
کی رفت بە دوزخ و کـی آمـد ز بـهشت؟



جـــام و شـــەراب و ســـاقی و لالەزار
بـۆ مـن بـێ و بـۆ تـۆ بـەهەشتی نـازار
بـاسی بـەهەشت و دۆزەخ بـەس بکـەن
کێ دۆزەخی دی، کێ بەهەشت یەك جار؟

# ١٢٥

ای آن‌کــــه نــــتیجه‌ی چـــهار و هـــفتی
در هــــفت چـــهار دائـــم انـــدر تـــفتی
مـــی خـــور کـــه هـزار بـار پـیشت گـفتم
بـــاز آمـدنت نـیست، چـو رفـتی رفـتی!



ئەی لە چوار و حـەوت کـە هـاتیتە دی
لە حەوتە لە چـوار ڕەنـج و دەردت دی
شەراب بـنۆشە چـەن جـار پـێم وتـی!
هــاتنەوەت نــییە کـــە مـردی، مـردی

## ١٢٦

مـــاييم و مـــی و مـطرب و کـنج خـراب
فـــارغ ز امـــيد رحـــمت و بـــيم عـذاب
جـــان و دل جـــامه پـــر درد و شـــراب
آزاد ز خــــاك و بـــــاد و از آتش و آب

شــەراب و یـــار و ســووچێکی بـاگـر
بـــەسمە نـــامەوێ لەمـــە زیـــاتر
کـــراس، گـــیان و دڵ، بـــارمتەی مـەیە
بـــێباك لە خـــاك و ئـاو و بـا و ئـاگـر

# ١٢٧

گر از پی شهوت و هوا خواهی رفت
از من خبرت که بی‌نوا خواهی رفت
بنگر چه کسی و از کجا آمده‌ای
میدان که چه می‌کنی، کجا خواهی رفت





له شوێنی شەهوەت، هەوای نەفس بڕۆی
له جیاتی شادی، دەرد و غەم ئەخۆی
بزانه تۆ کێی، له کام لا هاتی؟
ئێسته چی ئەکەی، بۆ کام لا ئەڕۆی؟

# ١٢٨

در پردەی اسرار کسی را رە نیست

زین تعبیە جان هیچکس آگە نیست

جز در دل خاك هیچ منزلگە نیست

بشنو کە چنین فسانە کوتە نیست





ڕێیەکە پەردەی ئەسراری خودا

پێچو پڵووچە کەس ڕێ دەرناکا

غەیری دوو تۆی خاك مەنزڵگە نییە

ڕێس و گوریسە، زوو نابێ کۆتا

# ١٢٩

در یـــاب کـه از روح جـدا خـواهـی شـد
در پـــردەی اســـرار فـــنا خـــواهـی شـد
مـــی نـــوش، نـــدانـــی ز کـی آمـدەای
خوش باش، ندانی بـه کـجا خـواهـی شـد



هـاکـا جـیا بـووینۆ لە ڕۆحـی شـیرین
چووینە تۆی دوو تۆی تـاریکی زەمـین
شـەراب بـنۆشە مـەعلوم نـایزانـین:
لە کـوێوە هـاتین و بـۆ کـوێ ئـەچین؟!

# ١٣٠

آمد سحری ندا ز میخانەی ما:
کە ای رند خراباتی و دیوانەی ما
برخیز کە پر کنیم پیمانە ز می
زان پیش کە پر کنند پیمانەی ما





دەمەو بەیانی لە مەیخانەی من
دەنگێ هات وتی: دێوانەیی من!
هەڵسە، پڕ بکەین پەیمانە لە مەی
بەر لەوە پڕکەن پەیمانەی مردن

# ١٣١

چـــون مــردن تــو مــردن یکــبارگــی است
یك‌بـــار بـــمیر، ایــن چــه بــیچارگــی است
خوبی و نــجاستی و مشــتی رگ و پــوست
انکار نــبود، ایــن چــه غــمخوارگــی است؟



هەر ئــەبێ بــمرین، نــە مــردن لە چــی؟!
مــردن یــەك جــارە، بــزووتن لە چــی؟!
خوێن و پیسایی و چنگی ڕەگ و پێست!
نەبوون باشترە، غەم خــواردن لە چــی؟

## ١٣٢

چون حاصل آدمی در این شورستان:
جز خوردن غصه نیست یا کندن جان
خرم دل آن کزین جهان زود برفت
آسوده کسی که خود نیامدبه جهان!



چی دەست ئەکەوێ لە ژیان ئینسان
غەیری غەم خواردن یا خۆ گیان کێشان
خۆزگەم بەوەی زوو لە دنیا دەرچوو
بەختیار کەسێکە کە نەیدی ژیان!

# ١٣٣

با مـــی بــــه کـنار جـوی مـی‌باید بـود
و از غـــصه کـــناره جـــوی مـی‌باید بـود
چون عـــمر گـــران‌مـــایه‌ی مـــا ده روز است
خـــندان لب و تـــازه روی مـــی‌باید بـود





کەناری جـۆیەك، شـەراب بـێ هـاودەم
کـــەنارە گـــیر بـــین، لە دەرد و لە غـەم
عـــومری شـــیرینی ئـــێمە یـەك دەمـە!
ڕوو خۆش و دڵشاد، بـژین هـەموو دەم

# ١٣٤

من بی می ناب زیستن نتوانم
بی جام کشید بار تن نتوانم
من بندەی آن دمم کە ساقی گوید:
یك جام دگر بگیر و من نتوانم





من بە بێشەراب قەت ژینم نابێ
بێ پیاڵەی پڕ مەی ڕوانینم نابێ
بەندەی ئەو ساتەم کە ساقی ئەڵێ:
جامێ‌تر بگرە، توانینم نابێ!

## ١٣٥

ســاقی غــم مــن بـلند آوازه شــده است
سر مستی مـن بـرون ز آوازه شــده است
با مـوی سـفید سـرخـوشم کـز مـی تـو
پــیرانـه سـرم بـهار دل تـازه شـده است



ســاقی غــه‌می مــن بــه‌رز ئـاوازه‌یه
ســه‌رخۆشیم زیـاد له ئــه‌ندازه‌یـه
هه‌رچه‌ند ڕیش سپیم، سه‌رخۆشم له‌مه‌ی
خــۆم پــیرو كــۆنم، دڵـم تــازه‌یه

# ١٣٦

تا زهره و مه بر آسمانند پدید
بهتر ز می لعل کسی هیچ ندید
من در عجبم ز می فروشان که ایشان
به زانچه فروشند چه خواهند خرید



تا مانگ و زوهره باقی ئەمێنێ
لە شەراب چاکتر کەس هیچ ناهێنێ
مەیفرۆش سەری چۆن لێ شێواوە
لەوەی ئەیفرۆشێ چاکتر ئەسێنێ؟

# ١٣٧

بـــر خـيز و بـــيا بُـــتا بـــرای دل مـــا
حل کن بــه جــمال خــویشتن مشکــل مــا
یك کـــوزەی مـــی بـــیار تـا نـوش کـنیم
زان پــیش کـــه کـــوزه کـنند از گـــل مـــا



هــەڵسە ســا ســاقی، تــازە گــوڵی من
لابـــــەرە غـــەم و دەردی دڵـــی مـــن
گـــۆزەیەك شـــەراب بـــێنە بـــی‌نۆشم
ئــەکــرێ بــە گــۆزە، ڕۆژێ گــڵی مـن!

# ١٣٨

صبحی خوش و خرم است، خیز ای ساقی
در شیشه کن آن شراب از شب باقی
جامی به من آر و دم غنیمت میدان
فردا چو رسد تو نیز خشت طاقی!



هەڵسە بەیانە، فیدات بم ساقی
هەر لەو شەرابە، شەو ماوە باقی
جامێ پڕ بکە؛ ئیمڕۆ فرستە
ڕۆژێ تێ کە تۆیش خشتێکی تاقی!

# ١٣٩

چـــندین غـم بـیهوده مـخور، شـاد بـزی
و انـــدر ره بـــیداد تـــو بـــا (داد) بـــزی
چون آخـر کـار ایـن جـهان نـیستی است
انگــــارکـــــه نـــیستی و آزاد بـــزی



بەس غـەمی بێسود بـخۆ، بـە دڵشـاد
لە دنـیا بـژی؛ (هـەرچی بـادا بـاد)
دنـــیا ئـاخری هـەر ئـاخر بـوونە
وەبـزانـە نـەبووی؛ بـژی وەك ئـازاد

# ١٤٠

من زین دل بی‌خبر به جان آمده‌ام
و از جان ستم‌کش به فغان آمده‌ام
چون کار جهان با من و بی من یکسان
پس من به چه کار در جهان آمده‌ام





دەردی دڵ تەواو گەیشتە گیانم
لە گیانم زیاتر من هەراسانم
من ببم، نەبم دنیا وەك یەکە
ئەبێ فائیدەی چی بێ ژیانم؟

# ١٤١

ای بس کـه نـباشیم، جـهان خـواهـد بـود
نـــه نـام ز مـا و نـه نشـان خـواهـد بـود
زیـن پـیش نـبودیـم و نـبود هـیچ خـللی
زین پس چو نباشیم هـمان خـواهـد بـود!





ئـــێمه نـــامێنین، دنـــیا ئـــەمێنێ
نـــاو و نـــیشانمان بـــه جـــێ نـــامێنێ
لەمـــەو بـــەر نـــەبوین دنـــیا نـــەڕووخا
لەمـــەو دواش نـــەبین هـــەر وا ئـــەنوێنێ!

# ١٤٢

گل گفت: به از لقای من رویی نیست
چندین ستم گلابگر باری چیست؟
بلبل به زبان حال با او می‌گفت:
یك روز كه خندید كه سالی نگریست؟





گوڵ وتی: سەیری ڕەنگم چەن جوانە
زوڵمی گوڵاوگر لای من تاوانە!
بولبولێ پێی وت بەزبانی حاڵ:
ڕۆژێ پێکەنین، ساڵێ گریانە!

# ١٤٣

دوشـــینه پـی شـــراب مـــی‌گردیـــدم
افســـــرده گـــلی، کـــنار آتش دیـــدم
گـفتم کـه چـه کـرده کـه مـی‌سوزنـدت؟
گـــفتا: نـــفسی دریـــن چـــمن خـندیدم!



دوێشـــەو بـۆ شـەراب مـن لە گـەڕانـدا
گـــوڵێکم بـــینی، لە ئـــاگـــردانـــدا
هـەڵقرچاو پـیم‌وت: بـۆ ئـەتسووتێنن؟
وتـــی: پـــێکەنیم لە نـــاو بـــاخاندا

# ١٤٤



مــحرم هســتی کــه بــا تــو گــویم یك دم:
کــز اول کــار خــود چــه بــودست آدم؟
مــحنت زدەی ســرشته انــدر گــل غــم
یك روز هــمین بــود و بــرداشت قــدم



چونکه مەحرەمی من پـێت ئـەڵێم زوو:
له هـەوەڵجاردا کـه ئـادەم چـی بـوو؟
بەدبەخت، له قوڕی غـەم دروست کـرا
بـۆ تـاقه ڕۆژێ، دەریـان پـەڕانـد زوو!

# ١٤٥

١

ساقی ببرم گر بت یاقوت لب است
ور آب خضر بەجای آب عنب است
گر زهره بود مطرب و عیسی همدم
چون دل نه بەجا بود نه جای طرب است



فەرزم کرد ساقیم وەك ماهتابە
گەر ئاوی حیات لە جێی شەرابە
زوهرە و موغەنی و عیسام هاودەم بێ
دڵ نارەحەت بێ لەلام عەزابە

# ١٤٦

گل گفت: کـه مـن یـوسـف مـصر چـمنم
یـــاقوت گـــران‌مـــایه‌ی پـــر زر دهـــنم
گـفتم: چـو تـو یـوسـفی نشـانی بـنمای
گـفتا: کـه بـه خـون غـرق نگـر پـیرهـنم



گـــوڵ وتـــی: مـــنم یـووسف بـه وێـنه
لەعـــلی دەهـــەنم یـــاقووت شکـــێنه
وتـــم: یـــووسفی نـــیشان بـــنوێنه
وتـــی: کـــراسم هـــا غـــەرقی خوێنه

# ١٤٧

در روی زمـــین اگــر مــرا یك خشت است
آن وجه می است اگر که نامش زشت است
مـــا را گـــویند: وجـــه فـــردای تـو کـو؟
دراعـــه و دســـتار نـــه مـریم رشـته است





کـــەڵکەڵەی شـــەراب واکـــەوتە ســـەرم
بـــە قـــەرز و حـــازر ئیش پـێکهێنەرم
پـێم ئـەڵێن: پـارەی بـەیانیت کـوانـێ؟
بۆچ «مریەم» ڕێسـای جـبە و مـێزەرم؟!

# ١٤٨

با مردم پاك و اهل و عاقل آميز
و ز نااهلان هزار فرسنگ گريز
ار زهر دهد ترا خردمند بنوش
ور نوش رسد ز دست نا اهل بريز

لەگەڵ عاقڵدا تێکەڵ بوون چاکە
پڕ بە پێ لە دەست ناکەس هەڕاکە
ناکەس وەکوو مار ناکاو ئەتگەزێ!
زەهری دانشمەند لە جێی تلیاکە!

# ١٤٩

در عالم جان به هوش می‌باید بود
در کار جهان خموش می‌باید بود
تا چشم و زبان و گوش بر جا باشد
بی چشم و زبان و گوش می‌باید بود



بۆ عالەمی ڕۆح پڕ بیر و هۆش بە
بۆ ئیشی دنیا لاڵ و خەمۆش بە
تا گوێچکە و چاو و زبان ئەمێنێ
بێ‌چاو، بێ‌زبان، بێ‌هوش و گۆش بە

# ١٥٠

خرم دل آن‌کسی که معروف نشد
در فوطه و در اطلس و در صوف نشد
سیمرغ‌وش از سر دو عالم برخاست
در کنج خراب همچو من بوف نشد



خۆزگە بەو کەسە پێی نەوترا زل
خوری و ئەتڵەسی بۆ نەکرا بە جل
لە هەر دو دونیا وەك «عەنقا» نەك وەك
منی بایەقوش؛ کەلاوە مەنزل

# ۱۵۱

خوش باش که غصه بی‌کران خواهد بود
بر چرخ قران اختران خواهد بود
خشتی که ز قالب تو خواهند زدن
ایوان و سرای دیگران خواهد بود



کەیف بکە، بێ‌غەم نابینی شەوێ
ئەستێرەی ئاسمان لە یەك ئەکەوێ؟
خشتێ لە خۆڵی لاشەی تۆ ئەکەن
بەر کۆشك و سەرای یەکێ ئەکەوێ

# ١٥٢

ای دل ز غبار جسم اگر پاك شوی

تو روح مجردی، بر افلاك شوی

عرش است نشیمن تو، شرمت بادا

کآی و مقیم خطەی خاك شوی



دڵە لە ژەنگی لاشە گەر پاکی

ڕۆحێکی پاکی، بۆ ئەفلاك چاکی

عەرشە جیگەی تۆ، تۆ شەرمت ببێ

کەبۆ چەن ڕۆژێ دانیشتووی خاکی

## ١٥٣

آن بـه کـه ز جام باده دل شاد کنی
وز نـامده و گـذشته کم یاد کنی
ویـن عـاریتی روان زنـدانـی را
یك لحـظه ز بـند عـقل آزاد کنی



به جـامێ شـه‌راب بـا دڵ شـاد بکـه‌ین
له بـوون و نـه‌بوون کـه‌متر یـاد بکـه‌ین
بـێچاره سـووکی له تـۆی زنـدانـا
له بـه‌ندی ژیـری، گـیان ئـازاد بکـه‌ین

# ١٥٤

از من رمقی به سعی ساقی مانده است
وز صحبت خلق بی‌وفاقی مانده است
از بادەی دوشین قدحی بیش نماند
و از عمر ندانم که چه باقی مانده است؟



نیو نەفەس ماوە ساقی لە ژینم
لە تێکەڵی خەڵق یەکجار بەقینم
لە بادەی دوێشەو یەك پیاڵە نەما
نازانم چی ما عومری شیرینم؟

# ١٥٥

چون کار نه بر مرادما خواهد بود
اندیشه و جهد ما کجا دارد سود؟
پیوسته نشسته‌ایم در حسرت آنك
دیر آمده‌ایم و رفت می‌باید زود



لە دەست ئەم چەرخە هەر خەفەت ئەخۆم
ڕەنجم بێ‌سوودە، بەڵکە ڕەنجەڕۆم
(چموچارمە) ڕۆژ و شەو ئەڵێم:
ئای درەنگ هاتم، هاوار زوو ئەڕۆم!

## ١٥٦

ای چرخ همه خسیس را چیز دهی
گرمابه و آسیاب و دهلیز دهی
آزاده به نان شب گروگان بنهد:
شاید که بر این چنین فلك (تیز) دهی





ئەم چەرخە پیسە، دۆستی ڕەزیلە
حەمام و قەسر و ئاش بۆ بەخیلە
(تڕها!) لە دەور و چەرخ و گەڕانت
دانا بۆ شێوی شەوی زەلیلە!

# ١٥٧

گــر بــر فــلكم دست بـدى چـون يـزدان
بــرداشـــتمى مـــن ايــن فــلك را ز مــيان
از نـــو فـــلكى دگـــر چـنان ســاختمى
كـــه آزاده بـــه كـــام دل رسـيدى آســان





گەر من وەك یەزدان دەسـەڵاتم ئـەبوو؟
چـــەرخى گـــەردوونم زوو هـەڵگرتبوو
ســـەر لە نـویٚ ڕەنگـى ڕەنگم ئـەڕێژا
ئـــازاد بـــە كـــامى دڵ بگـــەن هـــەموو

# ١٥٨

گــر آمــدنم بــه مــن بدی، نـامدمی
ور نیز شدن بـه مـن بـدی، کـی شـدمی؟
به زان بـندی کـه انـدر ایـن دیـر خـراب
نــه آمــدی، نــه شــدمی، نـه بـدمی!





کـەی مـن هـاتنم بـەدەستی خـۆم بـوو
یـا خــۆ مــردنم بــە ئـارەزوو بـوو؟
هــاتن و، بـوون و، ڕۆیــین لە دنــیا
هـیچم نـە ئـەویست دەسـەڵاتم نـەبوو

# ١٥٩

آن‌کس که زمین و چرخ و افلاك نهاد؟
بس داغ که او بر دل غمناك نهاد
بسیار لب چو لعل و زلفین چو مشك
در طبل زمین و حقەی خاك نهاد!





ئەو کەسەی زەوی و چەرخی داناوە
زۆر داغی گەرمی بە دڵدا ناوە
چەن لەعلی لێو و چەنێ زوڵفی لوول
یەك یەك نایە خاك؛ ڕزا و پواوە؟

# ١٦٠

نــه لایـق مسـجدم نــه در خــورد کـنشت
ایــزد دانــد گــل مــرا از چــه سـرشت:
چون کـافر درویشـم و چـون قـحبه زشت
نــه دیــن و نــه دنـیا و نــه امـید بـهشت!



نەکـەنشتە چـوون نــە مـزگەوت بـینین
لە کـام گـڵ خـولقام بـۆ خـوایـە زانـین
دین و بەهەشت و دنیام لە دەست چوو
وەك گاوری لات و قـەحبەی نـاشیرین!

# ١٦١

ای بــی‌خبران جســم مــجسم هــیچ است
و ایــن طــارم نــه ســپهر ارقــم هــیچ است
خــوش بــاش کــه در نشــیمن کــون فســاد
وابســته‌ی یك دمــیم، آن هــم هــیچ است!



ئــەم لاشــە بــۆشە هــیچە؛ بێ‌خەبەر
نــۆ تــەبەق ئــاسمان هــیچە ســەراســەر
خــۆش بــژی تــۆزێ، نــازانــی ژیــان
یــەك هــەناسەیە هــیچە دێــتەدەر!

# ١٦٢

آن‌هـــا کـــه فـــلك ریـــزەی دهـــر آرایـــند
آیـــند و رونـــد و بـــاز بـــا دهـــر آیـــند
در دامـــن آســـمان و در جـــیب زمـــین
خـــلقیست کـــه تـــا خـــدا نـــمیرد زایـــند

ئەستێرەی ئاسمان ڕیز ڕیز لە سەر ڕێن
ئـــاوا ئـــەبن و چـــین بـــە چـــین هـــەڵدێن
مـــەخلووقی دەوری زەوی و ئـــاسمان
تـــا نـــەمرێ خـــودا هـــەر لە زاوزێن!

# ١٦٣

تـــا کـــی غـم آن خــورم کــه دارم یــا نـــی
وین عــمر بــه خــوش‌دلی گــذارم یــا نـــی؟
پر کــن قــدح بــاده کــه مــعلومم نــیست:
کــه ایــن دم کــه فــرو بــرم بــرآرم یــا نــی





تا کـەی من غـەمی بـوون و نـەبوونی
بــە خـــۆشی ئــەژیم یــا بە زەبـوونی
پـــڕکە پـیاڵە هـیچ مــەعلووم نــییە
ئـەم هـەناسەیە داچــوو و دەرچـوونی!

# ١٦٤

دی کـوزه‌گـری بـدیدم انـدر بـازار
بـر پـاره گـلی لگـد همی زد بسیار
وان گـل بـه زبـان حـال بـا او مـی‌گفت:
مـن هـمچو تـو بـوده‌ام مـرا نـیکو دار

گـۆزه‌گـه‌رێکم دوێ دی له مـه‌یدان
قـوڕی ئـه‌شێلا بـه دڵ و بـه گـیان
بـه زبـانی حـاڵ ئـه‌و قـوڕه ئـه‌یگوت:
من وه‌کوو تۆ بووم به‌س بێ تێك‌شێلان

# ١٦٥

این کوزه گران که دست در گل دارند
عقل و خرد و هوش بر آن بگمارند!
بر گل لگد و تپانچه تا چند زنند
خاك بدن است تا چه می‌پندارند



ئەوانەی قوڕی گۆزە ئەشێلن
بە دست و بە پێ هونەر ئەنوێنن!
تا کەی پێ‌لەقە، شەپازلە تا کەی؟
بۆ دست و پەنجە و گەردن ئەشکێنن؟

# ١٦٦

دل سرّ حیات اگر کماهی دانست
در مرگ هم اسرار الهی دانست
امروز که با خودی ندانستی هیچ
فردا که ز خود روی چه خواهی دانست





دڵ سیرڕی ژینی ئەگەر ئەزانی
ڕێی بۆ ئەسراری مەرگیش ئەهانی!
تۆ ئێستە زیندووی، واقت وڕماوە
کە بمری ئەوسا زانین ئەتوانی؟!

# ١٦٧

اجرام کە ساکنان این ایوانند
اسباب تردد خردمندانند
هان تا سررشتەی خرد گم نکنی
کانان کە مُدْبِرند سرگردانند





لەو ئەستێرانەی وان بە حەواوە
خیرەدمەند هەموو هۆشیان داماوە
نەکەی سەر ڕشتەی خیرەد گوم بکەی
عاقڵ‌تر زیاتر سەر لێ شێواوە!

# ١٦٨

در کارگه کوزه گری بودم دوش
دیدم دو هزار کوزه گویا و خموش
هریك به زبان حال با من گفتند:
کو کوزه گر و کوزه خر و کوزه فروش



لای گۆزەگەرێ دوێنێ لە بازاڕ
چەند گۆزەم بینی بێدەنگ و دەنگدار
یەك بە یەك ئەیگوت بە زبانی حاڵ:
کوا گۆزە فرۆش، کوانێ خەریدار

# ١٦٩

هـــان کـوزه گـر را بـپای اگـر هشـیاری:
تـــا چـــند کـــنی بـــر گـــل آدم خـــواری
انگشت فـــــریدون و کـــف کـــیخسرو
بـــر چـــرخ نـــهاده چـــه مـــی‌پنداری؟



تـاکـەی گـۆزەگـەر بـە گـڵ شـەنوکەو
بەسە ئـازاری لاشـەی ئـەم و ئـەو
بـە چـی ئـەزانـی وا وردی ئـەکـەی
پەنجەی فەرەیدون، دەستی کەیخەسرەو

# ١٧٠

می خوردن و شاد بودن آیین من است
فارغ بودن ز کفر و دین، دین من است
گفتم به عروس دهر: کابین تو چیست؟
گفتا: دل خرم تو کابین من است





شەراب و شادی ئایینی منە
بێباك لە کفر و دین، دینی منە
پرسیم لە بووکی دنیا: مارەییت؟
وتی: دڵ خۆشیت کابینی منە!

# ١٧١

شــــیخی بـــه زن فــاحشه گــفتا: مســتی؟
هــــر لحـــظه بـــه دام دگـــری پـابستی!
گـــفتا: شــیخا هــر آن‌چـه گـویی هســتم
امـــا تـــو چـنان‌کـه مــی‌نمای هســتی؟!



شــێخێ بــۆ تــەمێی ژنــێکی بەدخوو
قــیڕە قــیڕی بــوو ئــەهات و ئــەچوو
ژن وتی: یـا شــێخ چــی ئـەڵێی مــن وام
بەڵام تۆ وەهـای وەك نـاوت دەرچـوو؟

# ١٧٢

ما افسر خان و تاج کی بفروشیم
دستار و قصب به بانگ نی بفروشیم
تسبیح که پیك لشكر تزویر است
ناگاه به یك پیاله می بفروشیم!





کورسی و تەختی خان لەگەڵ تاجی «کەی»
مێزەر و جبە بە یەك سۆزەی نەی
تەسبێح پێشداری لەشکەری ڕیا
لە پڕ من ئەیدەم بە یەك پیاڵە مەی!

# ١٧٣

من هیچ ندانم که مرا آن‌که سرشت
از اهل بهشت کرد، یا دوزخ زشت؟
جامی و بتی و بربطی و لب کشت:
این هر سه مرا نقد و ترا نسیه بهشت





نازانم؟ کاتێ کە دروست کرام
بۆ بەهەشت یا بۆ دۆزەخ دانرام
وەعدەی بەهەشتم دابە تۆ، بۆ من
عوود و شەراب و یاری دڵارام

# ١٧٤

گر مـی نـوشـد گـدا بـه مـیری بـرسـد
ور روبــهکی خــورد بـه شـیری بـرسـد
ور پـیر خــورد جــوانــی از سـر گـیرد
ور زان‌که جـوان خـورد بـه پـیری بـرسـد

سـوالکـەر مـەی بـخوا مـیری مـیرانـە
گــەر ڕێـوی بـیخوا شـێری ژیـانە
جـاهیل بـینۆشێ ئـەگـا بـە پـیری
پـیر بـە نـۆشینی وەك نـەوجوانـە

# ١٧٥

سر دفتر عالم معانی عشق است
سر بیت قصیده‌ی جوانی عشق است
ای آن‌که خبر نداری از عالم عشق
این نکته بدان که زندگانی عشق است



سەرلەوحەی عیلمی مەعانی عەشقە
شابەیتی شیعری جوانی عەشقە
ئەی بێ‌خبری کزەی سۆزی عەشق
خۆشی لە ژیان نایزانی عەشقە!

# ١٧٦

در دهر کسی به گلعذاری نرسید
تا بر دلش از زمانه خاری نرسید
در شانه نگر که تا به صد شاخ نشد
دستش به سر زلف نگاری نرسید



کێ دەستی گەیشت لە دنیا بە گوڵ
نەیدا لە دڵی کسپەی دڕکی چڵ
سەیری شانە کەن تا لەت لەت نەبوو
تێکەڵی نەبوو بە زوڵف و کاکوڵ!

# ١٧٧

در چشم محققان چه زیبا و چه زشت
منزلگه عاشقان چه دوزخ چه بهشت
پوشیدن بیدلان چه اطلس چه پلاس
زیر سر عاشقان چه بالین چه خشت



لای عاشق یەکە گەر شیفا، گەر دەرد
هێلانەی عاشق چ گەرم و چ سەرد
وەك یەك ئەپۆشێ ئەتڵەس و پەڵاس
سەرینی عاشق چ پەر بێ چ بەرد

# ١٧٨

مـــاهی امـــید عـــمرم از شست بـــرفت
بـــی‌فایده عـــمرم چـو شب مست بـرفت
عـــمری کـــه ازو دمـــی جـــهانی ارزد
افســـوس کـــه رایگـــانم از دست بـــرفت





مـــاسی ئـــومێدم لە تـــۆڕ دەر پـــەڕی
عومرم وەك شەوی سەرخۆش تـێپەڕی
عـــومری شـــیرینی گـــرانـــمایەی مـن
سەد حەیف بە هـەرزان لە مـنیان کـڕی

# ١٧٩

عالم همه محنت است، ایام غم است
گردون همه آفت است، گیتی ستم است
فی الجمله، چو در کار جهان می‌نگرم:
آسوده کسی نیست و گر هست کم است:



عالەم میحنەت و ئەندووه و غەمە
دەورانی گەردوون دەرد و ستەمە
لە گەردشی چەرخ سەرنجە ئەدەم
کەس ئازاد نییە گەر بشبێ کەمە

## ۱۸۰

هـــفتاد و دو مـــلتند در دیـــن کـــم و بـــیش
از مـــلت‌ها عشـــق تـــو دارم در کـــیش
چه کفر، چه اسلام، چه طـاعت، چـه گـناه
مـــقصود تـــوی، بـــهانه بـــردار از پـــیش!

حـــه‌فتا و دو مـــیلله‌ت خـــه‌ریکی دیـــنه
بـــه‌ڵام مـــن عـــه‌شقی تـــۆ لام ئـــایینه
له کـــفرو ئـــیسلام، تـــاعه‌ت و گـــوناه
مه‌قسوود هـــه‌ر تـــۆیه و هـــه‌ر تـــۆ بـــینینه

## ١٨١

هین، صبح دمید و دامن شب شد چاك
برخیز و صبوح کن، چرایی غمناك؟
می نوش دلا، که صبح بسیار دمد
او روی به ما کرده و ما روی به خاك





دەمی بەیانە، شەبەق بوو ڕووناك
پڕکە پیاڵە، قەت مەبە غەمناك
شەراب بنۆشە، زۆر شەبەق هەڵدێ
ئەو ڕوو لە ئێمە و ئێمە ڕوو لە خاك

# ١٨٢

سنت مکن و فریضه را هم مگذار
وان لقمه که داری ز کسان باز مدار
غیبت مکن و دل کسان را مازار
در عهدەی آن جهان منم، باده بیار



بۆ فەرز و سوننەت هیچ تێمەکۆشە
نانێکت گەر بوو لە کەس مەیگووشە
ناوی کەس مەبە، کەس مەڕەنجێنە
بەهەشت هی خۆتە! شەراب بنۆشە

# ١٨٣

عـــید آمـد و کـارهـا نکـو خـواهـد کـرد
ســاقی مـی لعـل در سبو خـواهـد کـرد
افســــار نـــماز و (پـــوزبـــند) روزه
عـــید از ســر ایـن خـران خـواهـد کـرد



جەژن هات، ئیشمان گەلێ بۆ چاك بـوو
ســاقی ســا شـەراب تـێكە زوو بـە زوو
لە ســەر كــەر و گــا چـەژن دای مـاڵی
زوو، ڕەشمەی نـوێژ و لەغـاوی ڕۆژوو

# ١٨٤

پیرانه سرم عشق تو در دام کشید
ور نه زکجا دست من و جام نبید؟
آن توبه که عقل داد جانان بشکست
وان جامه که صبر دوخت ایام درید





به پیری عەشقت سەری خستمە داو
ئەینا من لە کوێ و شەرابی بەدناو؟!
جانانە تۆبەی عەقڵی شکاندم
کراسی سەبرم لەت لەت و دڕاو

# ١٨٥

بـــر خـــود درِ کـــام و آرزو را بســـتم
وز مـــنّت هـــر نـــاکس و کس وارســـتم
جز دوست چو کس نیست که گـیرد دسـتم
مـــن دانـــم و او چـــنان کـــه هســـتم هسـتم



دەرگـای ئـارەزوو و مـەقسەد دائـەخـەم
لە کـەس و نـاکـەس هـیچ داوا نـاکـەم
غەیری دۆست کەسێ دەستم نـاگـرێ!
هـەر ئـەو ئـەزانـێ هـەر چلۆنێ هـەم

# ١٨٦

تـا چـند اسیر رنگ و بـو خـواهـی شـد
چند از پی هر زشت و نکو خـواهـی شـد؟
گـر چشـمەی زمـزمـی و گـر آب حـیات
آخـر بـه دل خـاك فـرو خـواهـی شـد





تـا کـەی خـەریکی ڕەنگ و بـۆ ئـەبین
تاوێ دوای جـوان و تـاوێ نـاشیرین؟
چاوگەی زەمزەم بی یـا ئـاوی حـەیات
قـووتت هـەر ئـەدا بـیری ژێـرزەمین!

# ١٨٧

چون حاصل آدمی درین جای دو در
جز درد دل و دادن جان نیست دگر
خرم دل آن‌که یك نفس زنده بود
و آسوده کسی که خود نزاد از مادر



چی دەست ئەکەوێ پیاو لە دنیای دوون؟
غەیری دڵ ئێشان غەیری گیان دەرچوون!
دڵخۆش یەکێکە یەك نەفەس بژی!
خۆزگەم بە وانەی لە دایك نەبوون

# ١٨٨

دنیا دیدی و هرچه دیدی هیچ است
و آن نیز که گفتی و شنیدی هیچ است
سرتاسر آفاق دویدی هیچ است
وان نیز که در خانه خزیدی هیچ است





دنیا و «مافیها»ی سەراسەر هیچە
چیت دیت و چیت بیست هەموو هەرهیچە
هیچە سەراپا دنیا خول بدەی
لە ژوور بۆ مردن بیتەدەر هیچە

# ١٨٩

ما لعبتگانیم و فلك لعبت باز
از روی حقیقت، نه از روی مجاز
بازیچه کنان بدیم بر نطع وجود
رفتیم به صندوق عدم یك یك باز



ئێمە بازیچە و گەردوون بازی باز
بە ڕووی ڕاستی نەك بە ڕووی مەجاز
بە بازی کردن هاتینە دنیا
چووینۆ بۆ عەدەم بە یەك «قەڵەم باز»

# ١٩٠

در کــــارگــه کــوزه‌گــری کــردم رای
در پـــله‌ای دیـــدم ایســـتاده بــه پـــای
مــــی‌کرد دلیـــر کـــوزه‌را دست و پـــای
از کــــلـه‌ی پـــادشاه و ز دست گـــدای





تـــێپه‌ڕیم بـــه‌لای گـــۆزه‌گـــه‌رێکدا
پێی له‌سه‌ر چـه‌رخی ده‌ستابوو وه‌ستا
به ده‌ست بۆ گۆزه ده‌ست و لووله‌ی کرد
له کـــه‌لله‌ی پـــاشا و له ده‌ســـتی گـــه‌دا

# ١٩١

از تن چو برفت جان پاك من و تو
خشتی دو نهند بر مغاك من و تو
وانگه ز برای خشت گور دگران
در كالبدی كشند خاك من و تو





که دەرچوو گیانی پاکی من و تۆ
خشتڕێژی ئەکەن لاکی من و تۆ
دیسان بۆ خشتی قەبری خەڵقی تر
ئەیخەنە قاڵب خاکی من و تۆ

# ١٩٢

بنگر ز جهان چـه طـرف بـر بسـتم، هـيچ
و ز حاصل عـمر چـيست در دسـتم، هـيچ
شـمع طـربم، ولى چـو بـنشستم، هـيچ
مــن جـام جـمم، چـو بشكسـتم، هـيچ





چيم بـرد له دنـياى بـێ‌پايان مـن هـيچ
يا خۆم چيم دەست كەوت له ژيان من هيچ
چراى شادى بووم، دواى كوژان من هيچ
با جامى‌جەم بم، دواى شكان من هـيچ

# ١٩٣

ایـــن چـرخ فـلك كـه مـا در او گـردانـیم
فــــانوس خـــیال ازو مـــثالی دانـــیم:
خـــورشـید چـراغ دانـــی و عـــالم فـانوس
مـــا چـــون صــوریم كـاندرو حـیرانـیم



له چەرخ و دەورەی چەرخ، سەرگەردانین
ســـوورەتگەرێکە، وەهـــای ئـــەزانـین
خــۆرە چــرای ئـەو، دنـیایە فـانووس
ئــێمە ســـوورەتین، تـیادا حـەیرانـین!

## ١٩٤

معشوقه که عمرش چو غمم باد دراز
امروز ز نو تلطفی کرد آغاز
بر چشم من انداخت دمی چشم و برفت
یعنی: که نکویی کن و در آب انداز



عومری درێژ بێ یارم وەکوو غەم
ئیمڕۆ لوتفی بوو بە بێزیاد و کەم
بەڵێ: چاکەی کرد دای بە دەم ئاودا
بە چاوی بینی چاوی پڕ گریەم

# ١٩٥

«خیام» که خـیمه‌های حکـمت مـی‌دوخت
در کــوره‌ی غـم فـتاد و نـاگـاه بسـوخت
مـقراض اجـل طـناب عـمرش ببرید
دلال امـــل بــه رایگـانش بـفروخت



خــه‌ییام خـێوه‌تی حکـمه‌تی دووران
که‌وته کووره‌ی غه‌م، سووتا به سووتان
مــه‌قه‌ستی ئــه‌جل تـه‌نافی بڕی
ده‌ڵاڵـــی ئـه‌مه‌ل فـرۆشتی هــه‌رزان

# ١٩٦

تـــا کـــی ز غـــم زمـانه مــحزون بـاشی
بـــا چشـــم پـر آب دل پـر خـون بـاشی
می نوش و به عیش‌کوش و خوش‌دل می‌باش
زان پـیش کـه زیـن دایـره بـیرون بـاشی





تـــا کـــەی بـۆ دنـیا غـەم ئـەخـەینە دڵ
چـاو پـڕ لە فـرمێسك، دڵت پـڕلە کـوڵ
شـــەراب بـــنۆشە بـــە بـــەزم و شـادی
بەر لە دەرچـوونت لە دنـیای سـەرچڵ

# ١٩٧

یك جرعە مى ز ملك كاوس بە است
و از تخت قباد و ملكت طوس بە است
هر نالە كە رندى بە سحر گاە زند
از طاعت زاهدان سالوس بە است





چۆڕێ لە شەراب هەموو مڵکی «کەی»
تەختی قوباد و مڵکی تووس و ڕەی
ناڵەی ڕەندانەی ڕەند لە بەیاندا
چاکتر لە نووزەی سۆفی و لە نووکەی

# ١٩٨

مــن در رمــضان روزه اگــر مــی‌خوردم

تــا ظــن نـبری کـه بـی‌خبر مــی‌خوردم

از مــحنت روزه روز مــن چـون شب بـود

پــنداشـته بـودم کـه سـحری مــی‌خوردم





من کـه ڕەمـەزان بـە ڕۆژ شـێو ئـەکـەم

خۆم موستەحەقی سـەد جـنێو ئـەکـەم

تــاریکی ڕۆژوو ڕۆژی کــرد بـە شـەو

وەهــا ئــەزانــم کــە پـارشێو ئـەکـەم

# ١٩٩

چون مرده شوم خاك مرا گم سازيد
احوال مرا عبرت مردم سازيد
پس، خاك و گلم به باده آغشته كنيد
و از كالبدم خشت سرخم سازيد





قەبرم وا تێکدەن نەبێ نیشانە
بمکەن بە عیبرەت بۆ ڕووی زەمانە
خۆڵم بە شەراب بە قوڕ بشێلن
بۆ خشتی سەری کووپەی مەیخانە

# ٢٠٠

در سر هوس بتان چون حورم باد
بر دست همیشه آب انگورم باد
گویند کسان: ترا خدا توبه دهد
او خود ندهد، من نکنم دورم باد

سەر پڕ لە سەودای یاری شۆخ و شەنگ
دەست بە پیاڵەی شەرابی گوڵڕەنگ
خەڵق ئەڵێن: خودا تۆبەت قەبوڵ کا
من نایکەم مەگەر خۆی بیکا بێ‌دەنگ

# ٢٠١

ای هـــم‌نفسان مـــرا بـــه مـــی قـــوت کـــنید
ویـــن چـــهره‌ی کـــهربا چـــو یـــاقوت کـــنید
چـــون مـــرده شـــوم بـــه مـــی بشـــویید مـــرا
و از چـــوب رزم تـــخته‌ی تـــابوت کـــنید



هاوسه‌ران بۆ من هه‌ر شه‌رابه قووت
سوور ئه‌كا ڕه‌نگی زه‌ردم وه‌ك یاقووت
كه مردم یاران بمشۆن به شه‌راب
هه‌م له داری مێو هه‌ڵبه‌ستن تابووت

# ٢٠٢

در خــواب بــدم مــرا خــردمــندی گــفت:
کز خــواب کســی را گــل شــادی نشگـفت
کاری چه کنی کـه بـا اجـل بـاشد جـفت
بــرخـیز کـه زیـر خـاك مـی‌باید خـفت



له شــیرین خــەودا پــیاوێکی هــۆشیار
وتــی: کـەس بـه خـەو نـابێ بـەختیار!
نــازانــی کـه خــەو بــرای مــردنە؟
هــەڵسە له خــاکدا ئــەخەوی نــاچار

# ٢٠٣

چون می‌گذرد عمر چـه شـیرین چـه تـلخ
پیمانه چو پـر شـود چـه بـغداد چـه بـلخ
می نوش که بـعد از مـن و تـو مـاه بسـی
از سلخ بـه غـره آیـد و از غـره بـه سـلخ



شیرین بێ، تاڵ بێ، عـومر هـەر ئـەڕوا
پــەیمانە پــڕ بــێ چ بــەڵخ، چ بەغدا
لە دوای مـن و تـۆ مـانگ گـەلێ ئـەڕوا
لە دوا بــۆ هــەوەڵ، لە هـەوەڵ بۆ دوا

# ٢٠٤

چون نیست ز هرچه هست جز باد بـدست
چون نیست ز هرچه نیست نقصان و شکست
انگار کـه هـرچـه هست در عـالم نـیست
پندار کـه هـرچـه نـیست در عـالم هست





چــی هـەیە هـەمووی ڕووی لە زەواڵـە
چــی نــییە نــەقسی نـییە، مــەحاڵە
وەهـــا بـــزانــە چــی هـــەیە نـییە
چــی نــییە هـەیە، سـەیرە ئـەم حـاڵە

# ٢٠٥

در میکده جز بـه مـی وضـو نـتوان کـرد
وان نـــام کـــه زشت شـــد نکـــو نـــتوان کـــرد
خوش باش که ایـن پـردەی مسـتوری مـا
بـدریده چــنان شــد کــه رفــو نــتوان کــرد



بە شەراب ئەیشۆم چاو و دەست و پێم
مەشهوور بووم، هەرکەس ئەزانێ من کێم
پەردەی مەستووریم چەشنی لەت لەتـە
شـــڕ و وڕم کـــرد، پـینە نـەکـرێ پێم

# ٢٠٦

در دهـــر بـــر نـــهال تـــحقیق نـــرست
زیـــرا کـــه دریـــن راه کســـی نـــیست درست
هـــرکس زده است دست در شـــاخی شست
امروز چو دی شناس و فـــردا چـــو نـــخست



له دنـــیا دارێ ڕاست هـــەڵ نـــەچوو
بـــۆیه هـــیچ کـــەسێ بـــۆ ڕاســـتی نـــەچوو
هەرکـــەس لقـــێکی گـــێڕ و وێـــڕی گـــرت
پـــێوه ئـــەلەرزێ و هـــاکـــا مـــانوو بـــوو

# ۲۰۷

در فصل بهار اگر بتی حور سرشت
پر می قدحی بمن دهد بر لب کشت
گر چه بر هرکس این سخن باشد زشت:
سگ به ز من ار زآنك برم نام بهشت



گوڵزاری بەهار و یاری گوێ ئاوێ
پیاڵەی شەراب، بە گۆشەی چاوێ
هەر چەن ئەم قسە زۆر ناشیرینە:
من لە جێ سەگ بم بەهەشتم ناوێ

# ٢٠٨

می خور کە مدام راحت روح تو اوست
آسایش جان و دل مجروح تو اوست
طوفان غم ار درآید از پیش و پست
در بادە گریز کشتی نوح تو اوست





شەراب بنۆشە بۆ ڕۆح دەرمانە
دەرمانی غەم و ڕاحەتی گیانە
گەر لافاوی غەم دنیا بماڵێ
سواری بادە بە کەشتی تۆفانە

## ٢٠٩

روزی کـه گـذشته است ازو یـاد مکـن
فـردا کـه نـیامده است ازو فـریاد مکـن
بـر نـامده و گـذشته بـنیاد مـنه
حالی خـوش بـاش و عـمر بـر بـاد مکـن



بێکەڵکە یادی ڕۆژی ڕابووردوو
یا پەلە پەلی ڕۆژی نەهاتوو
بێسوودە باسی ڕابووردوو و نەهات
فرسەتە زینهار ئێستەت لە دەستچوو!

# ٢١٠

چون چرخ به کام یك خردمند نگشت
خواهی تو فلك هفت شمر خواهی هشت
چون باید مرد و آرزوها همه هشت
چه مور خورد به گور و چه گرگ به دشت

چەرخ بە ئارەزووی دانا ناکا گەشت
گەر حەوت تەبەقە یاخۆ تەبەق هەشت
کە مردی لاشەت چی ئەیخوا بیخوا
مێرۆلەی قەبر یاخۆ گورگی دەشت

# ٢١١

از جملەی رفتگان این راه دراز
باز آمدە کو کە خبر گوید باز
هان بر سر این دو راهەی آز و نیاز
تا هیچ نمانی کە نمی‌آیی باز



ئەم ڕێ درێژە بۆ نەبڕیاوە
ڕێبوارێ بۆچی نەهات لەلاوە؟
چی بە جێ ئێڵی لەم دوو ڕێگانە؟
کە مردیت بە خوا نایەیتە دواوە!

# ٢١٢

«خیام» اگـر ز بـاده مسـتی خـوش بـاش
با ساده رخـی اگـر نشسـتی خـوش بـاش
چــون عـاقبت کـار جـهان نـیستی است
انگار که نیستی چـو هسـتی خـوش بـاش



خەییام بـە بـادە، بـە نـەی دڵـخۆش بـە
بە ساقی سـادە، بـە مـەی دڵـخۆش بـە
دنـــیا ئـــەوەڵ و ئـــاخر نـــەبوونە!
وابزانە نەبوویت کە هەیت دڵـخۆش بـە

# ٢١٣

چون نیست مقام ما در این دیر مقیم
پس، بی می و معشوق (خطایی است عظیم)
تا کی ز قدیم محدث ای مرد سلیم؟
چون من رفتم، جهان چه محدث چه قدیم!



بەم تەرحە دونیا نەبینیٚ دوشمن
بیٚمەی و مەعشووق، مردنە مردن!
تا کەی لە کۆنی و تازەی دنیا باس
تازە بیٚ، کۆن بیٚ وەك یەکە بۆ من

# ٢١٤

زان کوزه مـی کـه نـیست در وی ضـرری
پر کن قدحی، بـخور و بـه مـن ده دگـری
زان پـیشتر ای صـنم کـه در رهگـذری
خـاك مـن و تـو کـوزه کـند کـوزه گـری!



لەو گـۆزە کـەوا لە شـەرابـە پـڕ
پـیاڵەیەك پـڕکە سـاقی کـتوپڕ
خۆت بیخۆ و بۆ مـن تـێکە سـەر و مڕ
بـۆ گـۆزە خـاکمان ئـەشێلن وەك قـوڕ

# ٢١٥

برجه، برجه، ز جامه خواب ای ساقی
در ده، در ده شراب ناب ای ساقی
زان پیش که از کاسهٔ سر کوزه کنند
از کوزه به کاسه کن شراب ای ساقی





دە هەڵسە، هەڵسە ساقی بەسیە خەو
با بێ شەرابێ وەك دەنووکی کەو
هاکا کاسەی سەر کرا بە گۆزە
لە گۆزە کاسە پڕکە بەر لە ئەو

# ٢١٦

تـــا چـــند اسـيرى عـقل هـر روزه شـويم
در دهرچه صد ساله، چـه يك روزه شـويم
خوش‌دار تو كأس مـى ازان پـيش كـه مـا
در كـــارگـــه كـــوزه‌گـــران كـوزه شـويم

ئه‌گه‌ر ڕۆژێ بێ یا سه‌د ساڵ ژیان
دیلی عه‌قڵین و بێزارین له گیان
بگره پیاڵه‌ی شه‌راب به‌ر له‌وه
ببین به گۆزه لای گۆزه‌که‌ران

دوش با عقل این سخن گفتم
کشف کن با من احتمالی چند
گفتم: ای مایه‌ی همه دانش
کرد خواهم ز تو سوآلی چند
گفتم: از عمر من شدم بیزار
گفت: سوز و بساز سالی چند
گفتم: این دور زندگانی چیست؟
گفت: خوابی و خیالی چند

دوێشەو بە هێواش من بە عەقڵم وت:
بۆم کەشف بکە چەن ئیحتیماڵێك
وتم: سەرمایەی زانین و ژیری
لە تۆ ئەپرسم، من چەن سوئالێك
وتم: لە ژیان یەکجار بێزارم
وتی: سووتان و سازان چەن ساڵێك
وتم: ئەم دەوری ژیانە چییە؟
وتی: خەوتنە یا چەن خەیاڵێك

گفتمش: چیست کدخدایی؟
گفت: اندکی عیش غصه سالی چند
گفتم: اهل ستم چه طایفه‌اند؟
گفت: گرگ و سگ و شغالی چند
گفتم: این دل به هوش کی گردد؟
گفت: چون خورد گوشمالی چند
گفتمش: چیست گفته‌ی خیام؟
گفت: پند است حسب حالی چند

وتـــم: ژن و مـــاڵ لە لای تـــۆ چـــۆنە؟
وتی: خۆشی کەم غـەمی چـەن ساڵێك
وتـــم: ســتەمكار كــام تـيرە و هـۆزە؟
وتی: سەگ و گورگ و چـەن شـوغاڵێك
وتـــم: كـــەی دڵـم هـۆشی دێتە بـەر؟
وتـــی: بـــا بـــیخوا چـــەن گـۆشەماڵێك
وتـــم: وتـاری (خـەییام) لات چـۆنە؟
وتی: بەڕاستی چـەن حـەسبی حـاڵێك

## سکاڵایەکی موتەرجیم

بێبەش لەو دنیا، لەم دنیا بەری
ئەو دەردی سەری، ئەم کوێرەوەری
ساقی شەرابێ بێنە فرسەتە
ژیان گاڵتەیە، دنیا قەشمەری



کە کەڵکت نەبوو تۆ بۆ نیشتمان
چاکترە لە تۆ، گاوان و شوان
بە بەرگ و خەو و خواردن ئینسانی
فەرقتان چییە تۆ لە گەڵ حەیوان؟!

دارێ بەر دار بێ لە پیاوی بێبەر
چاکترە لە لای ئەربابی هونەر
بەری ئەو تۆزێ هەژار تیر ئەکا
بەری بێبەری دەردە؛ دەردی سەر



قەومێ کلۆڵ بێ خەوی گرانە
وەکوو کەروێشکی نوستووی ناو لانە
دیاردی لێ ئەکەن چاو ئەنووقێنێ
گەماڵ ئەیگرێ بۆ تیر و تانە

قەومێ نەفام بێ دوای خەڵك ئەکەوێ
جێی خۆی خۆش ئەکا «بزن بۆ شەوێ»
تا ماڵ وەستا بێ مزگەوت حەرامە
ماڵت ڕووخاوە «نێرگەی» ئەنەوێ

کێ دەس بۆ دەرگای هەژارێ ئەبا؟
کێ ئەیکاتەوە غەیری «ڕەشە با»!
دەست و قەڵەمی ئەم چەرخە شینە
بۆ سەر سپی و سوور دایم ڕەش ئەبا

نەعوزو بیللا، چاوی کردگار
ئەڵێی نوقاوە لە عاستی هەژار
ئاه و نزۆڵە سەنگ دێنێتە دەنگ
بێ تەئسیر نابێ ناڵەی دەردەدار

## وەرگێڕ لە چەند دێڕدا

■ خوا لێخۆشبوو شێخ سەلام کوڕی شێخ ئەحمەد، لە شێخانی عازەبانی دەوروبەری هەڵەبجەیە.

■ لە ساڵی ١٣١٠ کۆچی مانگی (١٨٩٢ زایینی) لە دایک بووە لە دواییدا نیشتەجێی سلێمانی ئەبێ.

■ شاعیرێکی نازک خەیاڵ و نووسەرێکی گەورە بووە، وە چەند زمانی زانیوە. لە ساڵی ١٣٧٩ کۆچی مانگی (١٩٥٩ زایینی) وەفاتی کردووە.

■ جگە لە دیوانی شیعر، چەند کتێبی تری لێ بە جێ ماوە وەک «شاری و لا دێی» «قەسابخانە» و «جوولەکەی کۆڵ گیر»





9789649800592

انتشارات کردستان

Kurdistan Publication

سنندج ـ پاساژ عزتی ـ تلفن: ٢٢٦٥٣٨٢